حکوم... عێراق

بەڕێوەبەرای... پەمەنییەکان




# پەروەردەی ئیسلامی

## بۆ پۆلی هەشتەمی بنەڕەتی

### ئامادەکردنی

عبد الله عبد الرحمن بابان    فاروق محمد علي عباس    واحد حمه صالح

عبد الجبار محمد شريف    ئازاد عمر سيد أحمد    خواجه طه شاهين

### وەرگێڕانی بۆ کوردی

صادق عثمان عارف

چاپی دووەم    ٢٠١٦زایینی – ١٤٣٧کۆچی – ٢٧١٦کوردی



## بەناوی خودای بەخشندەو میهرەبان

# پێشەکی

ئەم پەڕتوکە- پەروەردەی ئیسلامی بۆ پۆلی هەشتەمی بنەڕەتی هەنگاوێکی دیکەی نێوکاروانی گۆڕانکاریو گەشەپێدانی پرۆگرامی پەروەردەی ئیسلامییە، کە وەزارەتی پەروەردە بەلیژنەیەکی پسپۆڕی سپاردووە.

لەئامادەکردنی ئەم پرۆگرامەدا ڕەوتێکی نوێ ڕەچاوکراوە، ئەویش گرینگیدانە بەپەند وەرگرتن لەژیانی پێغەمبەرانو هەندێك لەهاوەڵانو شوێنکەوتوانو زانایان، وەك سەرمەشقی خزمەتکردنو بانگەواز بۆئاینی ئیسلام و خوداناسی، ئەمە سەرەڕای ئاماژە پەرستشیەکان، بەمەبەستی بەرچاو ڕوونکردنی نەوەکانمانو شارەزابوونیان لەئاینو پەروەردەکردنیان بەشێوەیەك ڕۆڵی خۆیان بگێڕن لەبنیاتنانی ئایندەی نیشتماندا.

وەك لەدەستپێکی پەرتوکە پێشترەکانی ئەم پرۆگرامەدا ئاماژەمان پێکردووە، ڕۆڵی لیژنەکەمان لێرەدا کۆتایی پێدێتو ئەرکی هاوڕێیانی پەروەردەکارمان دەست پێدەکات لەگەیاندنی ئەم پەیامە بە ڕۆلەکانمان. هەر کەم و کوڕیو هەڵەو پەڵەیەکیشیان بەدیکرد هیوادارین ئاگادارمان بکەن تا لە چاپەکانی داهاتودا چارەسەریکەین.

لەخودای باڵادەست دەخوازین هەمووومان سەرکەوتووبکات بۆ بەئامانج گەیاندنی کاروانی پەروەردەیی لە کوردستاندا.

**لیژنەی ئامادەکار**

﴿وَقُل رَّبِّ زِدْنِي عِلْمًا﴾

(طه ١١٤)



﴿ وَٱلۡعَصۡرِ ۝١ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَفِى خُسۡرٍ ۝٢ إِلَّا
ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَتَوَاصَوۡاْ
بِٱلۡحَقِّ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ ۝٣ ﴾ (صدق الله العظيم)

## وانەی یەکەم

# باوەڕ بە پەڕتوکە ئاسمانیەکان

ئازاد داوای لەباپیری کرد(کە شارەزا بوو لەژیانی پێغەمبەران)، کورتەیەکی بۆ باسبکات سەبارەت بەو پەندو وانانەی لەدابەزینی پەڕتوکە ئاسمانیەکان بۆ پێغەمبەران وەردەگیرێت.

باپیری گوتی، کوڕم، خودای گەورە بە پەیامەکانی بۆیان پشتگیریو کۆمەکی دەکردن، لەهەمان کاتدا فێڵی دوژمنەکانیانی پوچەڵ دەکردەوەو سەرشۆری دەکردن. ئازارو کێشەکانی ژیان سەختترین تاقیکردنەوەن بۆ مرۆڤ، بە ئەزمون، پێغەمبەران بەهێزترو خۆڕاگرترەبونو سەرکێشەکانیش کە پێشەنگی بێباوەڕی بوون شکستیان دەخوارد. ئەمەش پەندە بۆ هاوشێوەکانیانو وانەی ئەزمونیشە بۆ نەتەوە چەوساوەکان، تا خۆڕاگر بنو دڵنیابن لەسەرکەوتن گەر دواشکەوێت.



**ئازاد:** باپیره هەندێك زانیاریشم لەبارەی پەڕتوكە ئاسمانییەكانەوە پێ بڵێ:

**باپیره:** باشە كوڕم. هەندێك لەو پەڕتوكانە، وەك: سوحوفی ئیبراهیم(دخ)و موسا(دخ) خودا لەقورئاندا فەرموویەتی: (( إِنَّ هَذَا لَفِي الصُّحُفِ الْأُولَى (١٨) صُحُفِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى (١٩))) (١٨-١٩ الاعلى).

**تەورات:** ئەو پەڕتوكەیە كە خودا ناردیە خوارەوە بۆ موسا پێغەمبەر(دخ)و فەرمانیشی كرد كە پێغەمبەرانی دوای ئەو پەیڕەوی حوكمەكانی بكەن.

**زەبور:** ناوی ئەو پەڕتوكەیە كە بۆ داود پێغەمبەر(دخ) دابەزیوە، وەك قورئان ئاماژەی پێدەكات:(( وَرَبُّكَ أَعْلَمُ بِمَنْ فِي السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ وَلَقَدْ فَضَّلْنَا بَعْضَ النَّبِيِّينَ عَلَى بَعْضٍ وَآتَيْنَا دَاوُودَ زَبُورًا )) (٥٥-الاسراء).

**ئینجیل:** پەڕتوكی عیسا پێغەمبەرە(دخ). قورئان دەفەرموێت:(( ثُمَّ قَفَّيْنَا عَلَى آثَارِهِمْ بِرُسُلِنَا وَقَفَّيْنَا بِعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ وَآتَيْنَاهُ الْإِنْجِيلَ ...)) (٢٧- الحديد).

**قورئانی پیرۆز:** ئەو پەڕتوكەیە كە خودای پەروەردگار كردیە موعجیزەی پێغەمبەرمان موحەمەد(دخ) كەپەیامێكی گشتییە بۆهەموو مرۆڤ وجیهانیان، نەك تەنها بۆ نەتەوەیەكی دیاریكراو، وەك پەڕتوكە پێشووەكان. خودا دەفەرموێت:((وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا كَافَّةً لِلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ))(٢٨سبأ).

موسڵمان باوەڕی بە گشت ئەم پەڕتوكانەو پەیامەكانی خودا لەنێوانیاندا هەیە، چونكە مەبەست ڕێنیشاندانی مرۆڤە لەهەموو پەیامە ئاسمانیەكاندا.

**ئازاد:** سوپاس باپیره گیان، زانیارییەكان زۆر بەنرخن.

## گفتوگۆ

١- پێناسەی باوەڕ بکە.
٢- مەبەست لەدابەزینی پەڕتوکە ئاسمانیەکان بۆسەر زەوی چییە؟
٣- چۆن دەسەلمێنرێت قورئان موعجیزەیە.
٤- خودای گەورە بەندەکانی بەچی تاقی دەکاتەوە؟



## وانەی دووەم

# چاکەکاری لەخودا پەرستی

خودای گەورە فەرموویەتی: ((بَلَى مَنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَلَهُ أَجْرُهُ عِنْدَ رَبِّهِ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ)) (١١٢-البقرة).

وفەرموویەتی: ((وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا مِمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ وَاتَّبَعَ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا وَاتَّخَذَ اللَّهُ إِبْرَاهِيمَ خَلِيلًا))(١٢٥-النساء).

سەرەتا باسی چاکترین شێوازی خوا پەرستن بکەین لەئاین، کە بریتییە – لەوەی لە وەڵامی پرسیاری حەزرەتی (جبرائیل) لەبارەی ئیسلام وباوەڕبوون، کەچووە لای پێغەمبەر (دخ) لەشێوەی پیاوێکی زۆر سپی وپرچ رەش وماندبوونی پێوە دیارنەبوو، هاوەڵانی پێغەمبەر(دخ) لەچوار دەورەی دانیشتبون (جبرائیل)یان نەناسی، ئەوەندە لەپێغەمبەر نزیك بووە تاوەکو چۆکی بەرچۆکی کەوت و دەستی لەسەر رانەکانی داناو پرسیارێکی گرنگی دەربارەی ئیسلام لەپێغەمبەر(دخ) کرد. ئینجا پرسیاری باوەڕداری وچاکەکاری لێ کرد، پێغەمبەر (دخ) فەرمووی:((**ان تعبد الله كانك تراه فان لم تكن تراه فانه يراك**)) ئەم فەرموودەیە، چەند واتایەکی گەورەو مەزنی هەیە، چاکەکاری دوحاڵەتی هەیە: یەکەم بەرزەکەیان ئەوەیە کەخودای گەورە بەدڵ ببینی هەر وەك ئەوەی بەچاو دەیبینی، هەر وەکو خۆی فەرموویەتی تۆش دەیبینی واتە دەتبینی، دووەم ئەوەیە بهێنییە بەرچاوی خۆت کەپەروەردگار هەموو کارەکانت دەبینێت، هەروەکو فەرموویەتی هەموو کارێك دەبینێت و بەرهەمی ئەو دوو حاڵەتەش ناسینی خودایە بەراستی.

ئەم واتایە زۆر لەقورئان باس کراوە خودا دەفەرمووێت:((أَلَا إِنَّهُمْ يَثْنُونَ صُدُورَهُمْ لِيَسْتَخْفُوا مِنْهُ أَلَا حِينَ يَسْتَغْشُونَ ثِيَابَهُمْ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ إِنَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ))(٥- هود).

پەروەردگار لەقورئانی پیرۆز بۆمان ئاشکرا دەکات هیچ شتێك لای ئەو وون نیەو نهێنیەکان ئاشکران، ئەو ئاگای لەناخی هەموو کەسێکە، جا ئاشکرابێت یاخود نهێنی، گەر مرۆڤی بێ توانا هەستی پێ بکات، کە خودای گەورە لەو بێئاگا نیە ئاگاداری هەموو شتێکە لەبڕواداری و ترس لەپەروەردگار.

پلەی بەرزی پەرستش ئەوەیە خودا بپەرستی وەك ئەوەی کەبیبینی، کە تۆ ئەو نابینی ئەو تۆ دەبینیٚ ئاگای لێتە، ئەمە واتای راستی پەرستشەو، بەمەش رەزامەندی پەروەردگار بەدەست دێنێت وە سەرکەوتوو دەبێت.

## پرسیار

١- کێ چووە لای پێغەمبەر (دخ)و پرسیاری کاروباری ئاینی لێپرسی؟ پرسیارەکەی دەربارەی چاکە بوو مەبەستی چی بوو؟

٢- لەم ئایەتە پەروەردگار ئاماژە بەچی دەکات:(( بَلَى مَنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَلَهُ أَجْرُهُ عِنْدَ رَبِّهِ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ )).

## چالاکی

بە پشت بەستن بە زانیارییەکانی وانەکانی پێشوو، بابەتێك بنووسە دەربارەی چاکە لە زۆر لایەنەوە؟

# وانەی سێیەم

## دوای مردنی مرۆڤ چ شتێك بەسوودە

پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی: (( اذا مات ابن ادم انقطع عمله الا من ثلاث صدقة جارية او علم ينتفع به او ولد صالح يدعو له)).

واتە: مرۆڤ دوای مردنی دادەبڕی لەدونیاو هیچ کردارێکی بۆ نامێنێت تەنها لەسیانیان ئەوانیش: چاکەی نەبڕاوەیە، وەك تەرخانکردنی بەرهەمی باغەکەی بۆ خواردنی هەژاران، یان خانوییەك بۆ نیشتەجێبوونی هەژارێك، یان کەم دەرامەتێك، کە بەردەوام سوودی لێ وەردەگرێت، دووەمیان سوود وەرگرتن لەزانست وزانیاری هەرکەسێك دوای مردنی بەبێ کەمکردنەوەی پاداشتی چاکەکەی لەدونیاو دوارۆژدا بەردەکەوێت، سێیەمیان پاڕانەوەو نزای وەچەیەکی سوودمەندن بۆ کەسی مردوو کەپێغەمبەر (دخ) فەرموویەتی: (( ولد صالح يدعو له)) مرۆڤی بێ سوود نە بایەخ بەخۆیی ونە بەدایکی وباوکی دەدات، ئەمەش ئاماژەیە بەگرنگیدان بەپەروەردەی راستەقینەی مندالان، تاسوود بەخش بن لەژیانو دوای مردنی کە پێغەمبەر (دخ) ئاماژەی پێکردووە نزا بۆ باوك و دایك و کەسانی دیکە لەخزمان، باشترە لەوەی پاداشتی پەرستشیان بۆ بکەی، لەبەرئەوەی پێغەمبەر (دخ) نەی فەرمووە وەچەیەکی چاك نوێژو رۆژوی بۆ بکات بەڵکو هاوەڵ و دۆستانیش نزا بکەن بۆ یەکدی باشە.

هەروەك لە درێژەی فەرموودەکە هاتووە کە مرۆڤ دوای مردنی لەکردارەکانی دادەبڕێت، تەنها پێغەمبەر (دخ) ئامارژەی پێکردووە مرۆڤ نوێژو رۆژو نزاو پاڕانەوە لەخودای گەورە داوا بکات، بۆیە نزای برای موسڵمان سوودی هەیە هەرچەندە کەسێکی نزیك نەبێت کەخودای گەورە فەرموویەتی:

((وَالَّذِينَ جَاءُوا مِنْ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ ))(الحشر -١٠).

پەروەردگار باس لەو کەسە چاکانە دەکات کە دوعاو نزا بۆ خۆیان وئەو کەسانە دەکەن کەبڕوادارن، ئەوکەسە مردوو بێت یان زیندوو، پێغەمبەر (دخ) فەرموویەتی هەر موسڵمانێك مرد (٤٠) چل پیاوی باوەڕدار لەسەر جەنازەکەی ئامادەبوون، خودای گەورە بەبەر شەفاعەتی خۆی دەخات، هەروەها پێغەمبەر (دخ) فەرموویەتی مردوو سوودمەند دەبێت لەنزای ئەو کەسانەی نوێژی مردووی لەسەردەکەن. هەروەها نزای منداڵ بۆ باوكو دایك وەك کرداری خۆیان وایە، چونکە بەشێکە لەوان.

## پرسیار

١- ئەو کردارانە چین کەسوودیان بۆ مرۆڤ هەیە لە دوای مردنی؟

٢- بۆچی منداڵ بەکرداری مرۆڤ هەژمار دەکرێت؟

٣- مەبەست لەزانستی سوودمەند چییە؟

## چالاکی

بە یارمەتی مامۆستاکەت ئەمانە راڤە بکە:

خودای گەورە فەرموویەتی:((وَالَّذِينَ جَاءُوا مِنْ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ )).

پێغەمبەر (دخ) فەرموویەتی :((هەر موسلمانێك مردو چل باوەڕدار نوێژی لەسەر بکەن بەبەر شەفاعەتی خودا دەکەوێت)).

## وانەی چوارەم

## برایەتی و پێکەوە ژیان لەئیسلامدا

نەوزاد داوای کرد لەسەرداری هاورێی کەسەبارەت بە هۆگری‌و پێکەوە ژیان لەئیسلامدا بۆی بدوێت.

سەردار گوتی: گوتاربێژی هەینی مزگەوتەکەی نزیکمان، گوتاری ئەم هەفتەیەی تایبەت کردبوو بەباسی برایەتی‌و پێکەوە ژیان لەئیسلامدا، دەیگوت: ئیسلام ئاینی خۆشەویستی‌و رێزو خوێندنەوەی بەرانبەرو یەکسانی نێوان مرۆڤەکان‌و رەگەزەکان‌و گەلانە، پێغەمبەری سەروەر(دخ) پەیامەکەی لەسەر بنەمای بانگەواز بۆ یەکدیناسین‌و برایەتی مرۆیی داڕشتووە.

ئەم بنەمایەی کە بناغەی پەیوەندی موسڵمانە بەبرای موسڵمانیەوە. ((لا فضلَ لعَربيّ على أعجَميّ ولا لأعجميّ على عربيّ الاّ بالتقوى)). ئەمە رەهەندێکە لێبوردەیی‌و مرۆڤدۆستی دەکاتە بناغەیەکی پتەو لەپەیوەندیەکاندا، تاوەکو هەمووان بەخۆشەویستی‌و برایەتی بژین کە لەم ئایەتە پیرۆزەدا بەدی دەکەین: ((يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ (١٣)))(١٣- الحجرات)

## گفتوگۆ

١- پەیامی ئاسمانی چییە؟

٢- نموونەی بانگهێشتکردن بۆ برایەتی بەفەرمودەیەکی پێغەمبەر بێنەرەوە.



# وانەی پێنجەم

## دادگەری ( داد پەروەری )

خودای گەورە دەفەرموێت:(( إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالْإِحْسَانِ وَإِيتَاءِ ذِي الْقُرْبَىٰ وَيَنْهَىٰ عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنْكَرِ وَالْبَغْيِ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ))(٩٠-النحل).

لەم ئایەتە سێ بنەمای پەیامی خودایی هاتووە:

١- دادگەری.

٢- چاکەکاری بەجوانترین شێوە.

٣- مافدان بەکەس وکار(خزمانو دۆستان).

### بنەمای یەکەم - دادگەری

بریتییە لە(هاوسەنگی راگرتن لەمامەڵەو ئاڵ وگۆردا) هەروەها بەرانبەر بە پرۆسەی سولح ونەهێشتنی ناحەزیدا. بناغەیەکی گرنگە کە بەرپرس لەسەرپەرشتی کردنی ژێر دەستانیدا رەچاوی بکات. دادگەری چەند رەهەندێکی هەیە:

١- مرۆڤ لەگەل دەروونی خۆیدا ئەویش بە (جڵەو گیری دەروون لەچاوچنۆکی و راهێنانی لەسەر رازی بوونو قەناعەت).

٢- لەنێو مرۆڤەکاندا بە (ئامۆژگاری یەکدی کردنو دوورکەوتنەوە لەناپاکی وئازاردانو ئاکاری ئاشکراو نهێنی وەك یەك بێت).

## داد پەروەری لەحوکم وفەرمانڕەوابیدا

خودای کاربەجێ فەرموویەتی:((... وَإِذَا حَكَمْتُمْ بَيْنَ النَّاسِ أَنْ تَحْكُمُوا بِالْعَدْلِ إِنَّ اللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُمْ بِهِ إِنَّ اللَّهَ كَانَ سَمِيعًا بَصِيرًا))( ٥٨- النساء)

خودای گەورە بەرژەوەندی وکاری هاونیشتمانیانی سپاردۆتە دەست دادوەرەکان، بۆیە پێویستە ئەوانیش دادگەربن لەحوکمداندا، بە یەکسانی مامەڵەی هەردوو لایەنی دادوەری بکەن لەحوکم، تەنانەت لە سەیرکردنیشدا لایەنگری پێوە دیارنەبێت. هەروەها لەسەر دادوەرەکان پێویستە بە ئارامی ونەرمی قسەبکەن ودووربن لەئارەزوبازی ولایەنگری چونکە دادگەری بناغەو بیمەی دەسەلاتە.

## داد پەروەری لەشایەتیداندا

ذ - بەرانبەر ناحەزو دوشمنیش، دادگەری پێویستە. خودای گەورە فەرمویەتی: (( وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلَّا تَعْدِلُوا اعْدِلُوا هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى ))(٨-المائدة).

دادگەری بەرانبەر دوشمن وبێ باوەڕیش، جیاوازی نیە لەگەل نزیکەکان وباوەڕدارانـدا هیچ پاساوێك دروست نیە بۆلایەنگری، ئەمەش دەبێتە هۆی دانەبەزینی قین وخەشمی خوداو هێمایە بۆ گوێرایەڵی پەروەردگار.

ب- بەرانبەر خزمان ونزیکان: خودای گەورە فەرمویەتی: ((وَإِذَا قُلْتُمْ فَاعْدِلُوا وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَى)) (١٥٢-الانعام).

واتە: گەر ئەو کەسەی حوکمەکە بەرانبەری دەکرێت لەخزمانیش بێت، پێویستە هەر دادگەرانە بڕیاربدرێت نە زیادەرەوی ونەکورت هێنان بەرانبەری بکرێت، یان لەدادگەری لابدرێت ولەسزا دەربازبێت. چونکە ئەو رەفتارە مافی خەڵکی دیکەی تێدا ون دەبێتو سپاردەکان دەشێوێن.

بەڵام ئایە تەنها بە بنەمای دادپەروەری کۆمەڵگە تەندوتۆڵو یەکگرتوو دەبێت؟ یان بنەمای دووەمیش پێویستە کە: چاکەکارییە.

## بنەمای دووەم - چاکەکاری

چاکەکاری لەجوانترین شێوەدا، گەیاندنی خێرو خۆشی بەخەڵك وگەیشتن بەپلەی هەرەبەرز لەکاری دنیاو دوارۆژیشدا. کە گەیشتنە بەپلەی هەرەجوان وتەواوو تەریب بەفەرمانی خوداو سوننەتی پێغەمبەرمان (دخ)، هەروەها نەوەستان لەئاستی بەجێهێنانی ئەرك، بەڵکو تێپەڕاندنی ئەو رەوشە بەرەو پێشبرکێ لەچاکەدا.

## بنەمای سێیەم - مافدان بەخزمان ونزیکان

فەرمانمان پێکراوە کە کەس وکارو نزیکان بێبەش نەکەین لەوەی خودا پێی بەخشیوین، چونکە ئەوە دەبێتە هۆی توندوتۆڵکردنی پەیوەندی نێوان خێزانو تاکەکانی، خۆشەویستیو سۆزو هاوکاری گەشە دەکات. بەمەش کۆمەڵگە بەئاراستەی چاکەو خۆشی هەنگاو دەنێت.

کەواتە بە پیادەکردنی ئەو سێ بنەمایە سیستەمێکی کۆمەڵایەتی بەهێز بەدی دێتو هۆکارەکانی کێشەو پەرتبوون لاواز دەبن، بەختەوەری لەنێوان خەڵکدا باڵدەکێشێتو دەرون ودڵەکان ئاسودە دەبن.

## گفتوگۆ

١- پێناسەی دادپەروەری بکە، چەند جۆرە؟

٢- شایەتیدان چۆن دەبێت گەر دژی دوشمنیش بوو؟ بەئایەتێکی قورئان پشتگیری بکە.

٣- ئەمانە شیبکەرەوە:

ئ- خودای گەورە فەرمانی پێکردوین لەبەخشیندا خزمان بێبەش نەکەین.

ب-بۆچی پێویستە پلەی (احسان) چاکەکاری بگاتە ئاستی لوتکەی هەرە جوان و پوختی.

## ئەمەکداری

خودا دەفەرموێت: ((وَأَوْفُوا بِعَهْدِ اللَّهِ إِذَا عَاهَدْتُمْ وَلَا تَنْقُضُوا الْأَيْمَانَ بَعْدَ تَوْكِيدِهَا وَقَدْ جَعَلْتُمُ اللَّهَ عَلَيْكُمْ كَفِيلًا إِنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ (٩١)))(النحل٩١).

ئەمەکداری پابەندبوونە بە پەیمانەوە، دەبێتە هۆی ڕەزامەندی خوداو بنەمایەکی ئاینییە. بەمەرجێك ئەو پەیمانە زیان گەیاندنی بۆ هیچ کەسو هاندەر نەبێت بۆ تاوانو پشتگیری لەکاری ناڕەواو ڕێگری لەبەرنامەی خودایی تێدا نەبێت. گرنگە لەپەیمان بەستندا خودای پەروەردگار بەچاودێر بزانرێت کە بێگومان لێپرسینەوە لەگەڵ پەیمانشکێن دەکات.

بردنەسەری پەیمان لەسیفەتی مرۆڤە هۆشمەندەکانە، وەك خودا دەفەرموێت: ((أَفَمَنْ يَعْلَمُ أَنَّمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ مِنْ رَبِّكَ الْحَقُّ كَمَنْ هُوَ أَعْمَى إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُولُو الْأَلْبَابِ (١٩) الَّذِينَ يُوفُونَ بِعَهْدِ اللَّهِ وَلَا يَنْقُضُونَ الْمِيثَاقَ (٢٠))) (الرعد).

لەم ئایەتەدا ئاماژەی تێدایە کە مرۆڤە ژیرەکان بە ئەمەکن بۆ پەیمانەکانیانو پەیمانشکێنی ناکەن. چونکە خودای گەورە بەشایەتو چاودێر دەزانن.

## جۆرەکانی ئەمەکداری

١- پابەندیو وەفاداری بەگرێبەستەوە.

خودای گەورە دەفەرموێت:((يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَوْفُوا بِالْعُقُودِ أُحِلَّتْ لَكُمْ بَهِيمَةُ الْأَنْعَامِ إِلَّا مَا يُتْلَى عَلَيْكُمْ غَيْرَ مُحِلِّي الصَّيْدِ وَأَنْتُمْ حُرُمٌ إِنَّ اللَّهَ يَحْكُمُ مَا يُرِيدُ (١))) (المائدة).

واتە: بەئەمەك بن و ئەو پەیمان و گرێبەستانە بپارێزن پابەندیتان پێوە ڕاگەیاندووە، گرێبەست لەئیسلامدا لەسەر ئەم بنەمایە بەندە: پێویستە لەسەر هەرکەسێکی موسڵمانی خاوەن باوەڕ پابەندبێت بە پەیمانو گرێبەستیەوە، گەر ڕێگری نەبوو.

**ئەم گرێبەستانەش:**

ئ- یان لەناخی بەندەکان خۆیاندایە، وەك ئەوەی: (خۆی سوێند دابێت لەسەر ئەنجامدانی کارێکی ڕێپێدراو).

ب- یاخود لە نێوان خوداو بەندەکەدایە، وەك:(ئەرکە شەرعیەکانی وەك نوێژو زەکات...هتد).
پ - یان لەنێوان مرۆڤەکاندا، وەك: (شەریکی، هاوبەشیکاری).
٢- سەرڕاستی لەپێوانو کێشاندا.
خودا دەفەرموێت:((وَأَوْفُوا الْكَيْلَ إِذَا كِلْتُمْ وَزِنُوا بِالْقِسْطَاسِ الْمُسْتَقِيمِ ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا (٣٥))) (الاسراء).
خودای میهرەبان فەرمانمان پێدەکات لەکێشانو پێواندا سەر ڕاست بین، کە دەبێتە هۆی ڕاکێشانی سەرنجی کڕیارو خۆشنودییان، سەرەڕای پاشە ڕۆژی گەشو ڕەزامەندی خودای پەروەردگارو پاداشتی لەدوارۆژدا.

| ژ | وشە | واتا |
|---|---|---|
| ١- | العقود | گرێبەست و پەیماننامەیەك لەسەرخۆت کردبێت بەماڵ یان لەنێوان خۆت و کەسانی دیکەدا بێت یان بەنوسراوی. |
| ٢- | ذا القربى | کەسە نزیکەکان (خزمانی نزیك). |
| ٣- | اوفوا الكيل | سەر ڕاست بن لەپێوان لەگەڵ کڕیار. |
| ٤- | القسطاس المستقيم | شایان (تەرازووی دادگەرانە). |
| ٥- | اولو الالباب | ئەو هۆشمەندانەی شوێن ئارەزوو نەکەوتون. |
| ٦- | هو اقرب للتقوى | واتە (دادگەری لە خوداناسیەوە زۆر نزیکە). |
| ٧- | يتذكّر | پەند وەردەگرێت. |
| ٨- | لا يجرمنّكم شنآن قوم | ستەم و تاوانی کەسانی دیکە نەبێتە هۆی هەڵەکردن و ستەمکردنتان. |

## گفتوگۆ

١- پابەندی بە پەیمانی خوداوە واتای چییە؟
٢- گرێبەست لەئیسلامدا چی دەگرێتەوە؟ جۆرەکانی بڵێ؟
٣-(سەر ڕاستیو کێشانو پێوانی دروست، چاکترە بۆ ژیانی دنیامان).
ئەم دەستەواژەیە شیبکەرەوە؟

## وانەی حەوتەم

# ڕێزگرتن لە ئیسلامدا

پرسی ڕێزگرتن لەنێو مرۆڤەکاندا پرسێکی خوازراوو گرنگە، موسڵمانان پێویستە بیکەنە سیمای خۆیانو بە بەهایەکی باڵای مرۆیی بزانن.

**پێغەمبەری خودا(دخ) فەرمویەتی:** **((ما من مسلم يكرم ذا الشيبة، إلاّ قيّضَ اللهُ له مَن يُكرِمُه في سِنِّه))**(رواه الترمذي).

پێغەمبەری سەروەرمان محمد(دخ) لەو فەرموودەیەی سەرەوەدا بانگهێشتی کردوین بۆ ئەو بەهایە، کە ئاکارێکی پەسندو باڵایەو ڕونی کردۆتەوەو گەر لاوێك ڕێزو شکۆمەندی بۆ بەساڵاچویەك دابنێت، خودای پەروەردگار دڵی کەسانی گەنج بۆ ئەویش نەرم دەکات، کاتێك تەمەنی چووە سەرەوە بۆ ئەوەی ڕێزی بگرن. بۆیە پێغەمبەر(دخ) کلتوری ڕێزگرتنی بە بەشێکی سەرەکی بەرنامەی ژیانی ڕۆژانەی موسڵمانان لەقەڵەمداوە. هەر لەڕێی ڕێزگرتنو خوێندنەوەی بەرانبەریشە، دەتوانین بچینە دڵی یەکدیو یەکدیمان خۆشبوێت.



ڕێزگرتن لەئاینی ئیسلامدا پێگەی دیاری هەیە و جەختی لەسەر کراوەتەوە، ئەم سیفەتە لەئاکاری باوەڕدارانەو پێویستە ئەوان پێشەنگ بن و ڕێز لەم کەسایەتی و بوارانە بگرن:

١- کەسانی بەتەمەن و بەساڵاچو. پێغەمبەر(د.خ) فەرمویەتی:((لیسَ مِنّا مَن لَم یَرحَمْ صَغیرَنا ویُوَقِّرْ کبیرَنا)) واتە: ئەو کەسەی بەزەیی بەبچوکەکانماندا نەیێتەوە ڕێزی شایستە لەگەورەکانمان نەگرێت، لەئێمە نیە.

٢- ڕێز لەمامۆستایان بگرن لەبەر زانست و پلەی زانیارییان، یەکێك لەفێرخوازانی بەردەستی پێشەوا شافیعی دەلێت: (سوێند بەخودا لەرووی شافیعیدا تەنانەت ئاوم بۆ نەدەخورایەوە).

٣- ڕێز لەکارگوزارانی قوتابخانە بگیرێت لەبەر ماندوبوونیان.

٤- ڕێزگرتن لەمیوان لەئاکاری باوەڕدارانە، پێویستە ڕوومان لەگەڵیان خۆشبێت وپێشوازییان لێبکەین بێ جیاوازی کردن لەنێوان هەژارو دەوڵەمەندا.

٥- ڕێزی هاوبەش لەنێوان کارمەندان و هاوڵاتیان تا کارەکانیان بە شێوەیەکی گونجاو رایی بکرێت.

٦- ڕێزگرتن لەنێوان کریارو فرۆشیاران، مامەڵە خۆشی و سانایی لەفرۆشتدا. پێغەمبەر(د.خ) فەرمویەتی: ((رَحِمَ اللهُ إمرءاً سَمحاً إذا باع وإذا آشترى، وإذا إقتضى)). واتە: (خودا ڕەحم بەمرۆڤی ئاسانکارو لێبوردەبکات، لەفرۆشتن و کڕین هەروەها دادوەریدا).

٧- ڕێزگرتنی شوێنکەوتوانی ئاینەکانی دیکە.

٨- ڕێزگرتنی یاسا بە جێبەجێکردنی.

ئەو مرۆڤەی ڕێزدارەو ڕێز لەکەسانی دیکە دەگرێت خاوەن دەروونێکی پوختەو ئاکاری بەرزە. لەرەفتارو گوفتاریدا ئەم هەڵوێستانەی خوارەوە بەرجەستە دەبێت:

١- بە وشەی جوان و زمانی شیرین لەگەڵ خەڵك دەدوێت.

٢- بەڕوویەکی کراوەو زەردەخەنەوە ڕووبەڕووی خەڵك دەبێتەوە.

٣- بەخۆشترین ناو لای خاوەنەکەی بانگی دەکات.

٤- دەستپێشخەری دەکات لەسڵاوکردندا.

٥- بەگەرمی دەست لەناو دەستی هاوڕێیانی دەنێت.

٦- گوێ بۆ وتەو ڕای کەسانی دیکە شلدەکات و قسەیان پێنابڕێت و بایەخی دەداتێ.

٧- بە ئەندازەی پێویست دەنگ بەرزدەکاتەوە، چونکە دەنگ هەڵبرین لەئادابی ئاخاوتن نیە.

٨- هەڵس و کەوتی لەگەڵ هاوڕێیانی شیرینە.

٩- زۆربەی کات بەرژەوەندی خۆی دەکاتە قوربانی بەرژەوەندی گشتی.

١٠- بەدیاری ناردن، خزمان و دۆستانی، بەسەردەکاتەوە.

١١- بەدڵفراوانییەوە بەرەو ڕووی ئازارو گازندەکانی خەڵك دەبێتەوە.

**سوود لەم وانەیە:**

١- بە ڕێزگرتنی باوك و دایکم دەیسەلمێنم خۆشم دەوێن.

٢- کاتێك باوك و دایکم قسەم بۆ دەکەن، گوێگرتنم بۆیان بەڵگەیە لەسەر هەستکردنم بە بەرپرسی.

٣- بەجێهێنانم بۆ ئامۆژگارییەکانی بابەو دایە دەیسەلمێنم ژیرو بە ئەدەبم لەماڵ و قوتابخانە.

## وانەی هەشتەم

## بەزەیی و سۆز لەئاینی ئیسلامدا

ئەم خەسڵەتە لەسروشتی مرۆڤە، لەدڵو هەستیدا بەدرێژایی تەمەن بەردەوامە، لەیاساو ڕێسا ئیسلامیەکانیشدا پێگەیەکی فراوانی هەیە. بەشێکە لەرەحمەت و میهرەبانی خودا بۆ بەندەکانی. پێغەمبەر (دخ) دەفەرموێت: ((**إنَّ اللهَ رفيقٌ يُحبُّ الرفقَ ويُعطي على الرفقِ مالا يعطي على العُنفِ ومالا يُعطي على ما سِواهُ**)).

واتە: بێگومان خودای پەروەردگار خاوەن سۆزەوئەوخەسڵەتەشی خۆشدەوێ، لەهەر کەسێشدا سۆزو میهرەبانی هەبێت خودای گەورە پاداشتی ئەوتۆی دەکات کە بەمرۆڤی ڕەق وتوند ڕەفتاری نادات. سەرجەم ئامارژەکان ئەوە دەگەیەنن کە موسڵمانان لەنێو خۆیاندا سۆزێکی بەهێز پێکەوە دەیانبەستێتەوەو لەگەڵ دەرەوەی خۆشیان هەر میهرەبانن. بەڵام مرۆڤەکان لەم هەستەدا جیاوازن و وەك یەك نین، ژیانیش بێ ئەم خەسڵەتە واتای دروست نابەخشێت. مرۆڤ هەستی خۆشەویستی و ڕق لێبونەوەشی هەیە، شادبون و دڵتەنگیشی دەبێت، پێکەنین و گریانیش دەیگرێت، نەرمی و توندیشی تێدا بەدیدەکرێت، کە ئەمانە هەموو لەسۆزگارییەوە سەرچاوە دەگرن، بەڵام گرنگ ئەوەیە بزانریت سۆز لەجێی خۆیدا ئەنجام بدرێت.

## بوارەکانی سۆزیاری

### ١- لەنێو مرۆڤەکاندا:

**ئـ - سۆز بەرانبەر باوكو دایك:** منداڵ باوكو دایکی خۆشدەوێتو گوێرایەڵیان دەکات و خزمەتیان دەکات. لەنەخۆشیدا هاوکاریانەو پێداویستیان بۆ جێبەجێدەکات لەهەمان کاتدا جێی پرسو ڕاو ڕاوێژن بۆی.

**ب - سۆزی باوك و دایك بەرانبەر منداڵەکانیان:** بریتییە لەخۆشویستنو پەیداکردنی بژێوی و کێشانی نەخشەی ژیانی دوارۆژیان، شەونخونیو پەروەردەکردنیان. وێنەی میهرو سۆزی باوك بۆ جگەر گۆشەکەی، لەنموونەی یەعقوبدا بەرجەستەیە کە لەدووریو لەتاو دابڕانی یوسفی کوری بینایی چاوەکانی لەدەستدا. وەك لەبەشە ئایەتێکی سورەتی یوسف

لەقورئاندا هاتووە ((وَتَوَلَّى عَنْهُمْ وَقَالَ يَا أَسَفَى عَلَى يُوسُفَ وَابْيَضَّتْ عَيْنَاهُ مِنَ الْحُزْنِ فَهُوَ كَظِيمٌ)). (يوسف-٨٤)
دەبێت باوكیش لەنێو منداڵەكانی دادپەروەر بێت، وەك پێغەمبەرمان (د.خ) فەرموویەتی: ((اتقوا الله واعدلوا في اولادكم))

پ – سۆزی هاوسەر: هاوسەران هاوبەشن لەژیاندا، و پێكەوە بەسەری دەبەن، سەرپەرشتیو بەخێوكردنی منداڵیان لەئەستۆدایە، رێزو پێزانین لەنێوانیاندایە. خودای گەورە دەفەرموێت: ((وَمِنْ آياتِهِ أَنْ خلقَ لكُم مِن أنفسِكم أزواجاً لِتَسكُنوا إليها وَجَعَلَ بَينَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً...))(٢١-الروم). هەروەها پێغەمبەر(دخ) سەبارەت سۆز بەرانبەر خێزان دەفەرموێت: ((خيارُكُمْ خيارُكُم لِنِسائِكُم)).
ت – سۆزیاری لەگەڵ كەس و كاردا: موسڵمان هەمیشە پەیوەندی لەگەڵ كەسو كاریدا دەپارێزێتو سەردانیان دەكات بەتایبەتی ئەگەر كەسێك لێی دابڕابێت.
پێغەمبەر دەفەرموێت(د.خ): ((اتقوا الله وصِلوا أرحامكُم)).
ج – سۆزو بەزەیی بەرانبەر نەخۆش: موسڵمان سەردانی برای موسڵمانی نەخۆشی دەكات، چونكە خودای گەورە ئەو كارەی زۆرپێ خۆشە و پاداشتی لەسەردەداتەوە، پێغەمبەر(د.خ) دەفەرموێت: ((مَنْ عادَ مريضاً لم يزل يخوض في الرحمة حتى يجلس فاذا جلس اغتمس فيها)).
ح – بەزەیی بەسواڵكەردا: سەبارەت بەسواڵكەر، موسڵمان نەرمی دەنوێنێتو بێبەشی ناكات گەر نەدار بوو. ((وأمّا السائلَ فلا تَنْهَرْ))(١٠-الضحى).
خ – سۆز لەبەرانبەر بێوەژناندا: مرۆڤی باوەڕدار بەخشینی هەیەو خێری دەوێ بۆ بێوەژنان، پێغەمبەر (د.خ) لەم رووەوە دەفەرموێت: ((الساعي على الأرملة والمسكين كالمجاهد في سبيل الله تعالى أو القائم الليل أوالصائم النهار)).

## ٢– بەزەیی و سۆز بەرانبەر گیانلەبەران:

ئاینی ئیسلام بە بەزەییەوە دەڕوانێتە گیانلەبەران، ئەوانیش وەك مرۆڤ جیهانی تایبەت بەخۆیان هەیە، خودای گەورە خاوەندارێتیێ بە مرۆڤ بەخشیوە، تا بەسۆز بێت بەرانبەر زیندەوەرانی دیكە، هیلاكیان ناكات، خۆراكو جێی حەوانەوەیان بۆدابین بكات، لەتوانای خۆیان زیاتر ئەركیان بەسەردانەدات. لەسەردەمی جێنشین عومەری كوری عەبدولعەزیزدا كەسێك ئەسپەكەی ماندوو كردبوو لەسەرو توانایەوە، بۆیە جێنشین فەرمانی دا تاسێ رۆژ ئەو ئاژەڵە لەمۆڵەتدا بێت و بحەوێتەوەو خزمەت بكرێت.

### ٣- تەنانەت سۆز بەرانبەر رووەکیش پێویستە:

لەم رووەشەوە ئاینی ئیسلام مرۆڤەکان هاندەدات لەسەر چاندن و سەوزکردن و ئاودان، پاداشتی بۆ ئەو بوارە دیاریکردووە رێگری کردووە لەبرینی درەختی زیندوو(سەوز) سزای لەسەر داناوە، چونکە سەرەرای بەخشینی جوانی بەسروشت فاکتەرێکی سەرەکیشە بۆخاوێنکردنەوەی ژینگەو بەرهەمهێنانی هەوای پاک، هەروەها سەرچاوەیەکی گرنگی داهات وئابوریە بۆ هاولاتییان. هەروەك نیشانەی شارستانیەت و پێشکەوتنیشە.

## بەرەنجامی سۆزو بەزەیی

**لە ئەنجامی بەزەیی و میهرەبانیدا مرۆڤ دەگاتە:**

١- توندو تۆڵی پەیوەندی لەگەڵ خزمان و گەشەدان بە هاتوچۆی نێوان هاورێیان و دراوسێیان.
٢- پتەوکردنی هەستی هاریکاری و یارمەتیدان.
٣- بەهێزکردنی پەیوەندییە کۆمەلایەتیەکان و نوێکردنەوەیان.
٤- ئەو کەسەی هەستی سۆزگەرایی تێدا زیندو بێت دڵی نەرمەو دوورە لەهەڵچون و مێشکی ئارامە.
٥- دەروازەی خێروخۆشی و رۆزی لێدەکرێتەوە. پێغەمبەر(د.خ) دەفەرموێت: ((مَنْ سَرَّهُ ان يبسط عليه رزقه او ينسأ في اثره فليصل رحمه))(الحديث)
٦-سۆزو بەزەیی نێوان مرۆڤەکان هۆکاری بەدەستهاتنی بەزەیی و رەحمی خودای گەورەیە بۆیان، بەبەڵگەی ئەم فەرموودەیە پێغەمبەر(د.خ) دەفەرموێت: (( إرحَموا مَن فی الارضِ يَرحَمكُم مَن فی السماءِ)).

# چەند كورتە بەسەرهاتێك لەبواری ( سۆزو بەزەییدا )

## ١- لەنێوان مرۆڤەكاندا:

رۆژێك هاوەلێك لەیاریدەدەران كەسێكی هەژاری بردەوە ماڵەوە، كاتێك لەخێزانەكەی پرسی چ خواردنێك لەبەر دەستایە بۆ ئەم میوانە؟ هاوسەرەكەی گوتی: چەند پارویەك، كە بۆ منداڵەكانم داناوە. ئەویش گوتی: منداڵەكان بەشتێكەوە سەرقاڵ بكەو روناكیەكە بكوژێنەوە تامیوانەكە هەست نەكات كە لەگەڵی ناخۆم و تێر ببێت. بۆ سبەینێ كاتێك هاوەڵەكە چوە خزمەت پێغەمبەر(د.خ) پێی فەرموو: خودای پەروەردگار ئەو كارەی ئێوەی زۆر پێ خۆش بوو.

## ٢- سۆز بەرانبەر گیانلەبەر:

پێغەمبەر(د.خ) دەیگێڕێتەوەو دەفەرموێت: ((لەبیابانێكدا رێبوارێك بیرە ئاوێكی بەدیكردو چوە خوارەوەو ئاوی لێخواردەوە، كاتێك هاتە سەرەوە بینی سەگێكی تینو زمانی دەرهێناوەو وشكبۆتەوەو پەرێشانە بۆ ئاو بۆیە تینوێتی خۆی بەبیرهاتەوەو دەست بەجێ دابەزیەوە ناوبیرەكەو لەپێلاوەكەیدا ئاوی هێنایە سەرەوەو لەبەردەم ئەو بەستەزمانەدا داینا تاتێر ئاوبوو، بەم كارەی زۆر دڵشادبوو خوداش لەگوناهەكانی خۆش بوو.

## گفتوگۆ

١- واتای وشەی(ذا الشیبة) لەفەرمودەکەی پێغەمبەردا شیبکەرەوە.

٢- پێغەمبەری سەروەر(د.خ) لەو فەرمودەیەدا بانگهێشتمان بۆچی دەکات؟

٣- ڕێزگرتن لەخەڵکی چۆن دەبێت؟

٤- ئاماژە بەچەند بوارێکی ڕێزگرتن لەنێو تاکەکانی کۆمەڵگەدا بکە.

٥- ئەو کارە چیە لەم وێستگانەی خوارەوەدا پێویستە ئەنجامی بدەیت:

ئ- پیرەمێردێك ببینی کۆڵێکی قورسی هەڵگرتووە.

ب- پیرێژنێك کەتواناى وەستانی نەبێت لەجێیەکدا.

پ - بەتەمەنێك بیەوێت بپەڕێتەوە لەشەقامێکدا.

ت- قوتابیەك تەمەنی لەتۆ زیاتر بێت، بیەوێت قسە بکات.

ج- قوتابیەك ڕەفتارێکی ناشایستەی بەرانبەر مامۆستاکەی ئەنجامدا.

## پرسیار

١- فەرمودەیەکی پیرۆز بنوسە ئاماژە بکات بۆگرنگی سۆزیاری و نەرمی لەئیسلامدا.

٢- هەروەها فەرمودەیەك لەسەر بەزەیی و سۆز بەرانبەر بێوەژنان.

**نیشانەی ڕاست یان هەڵە لەبەردەم هەر دەستەواژەیەك دابنێ:**

١- ئەرکی باوکە نەخشەی ئایندە بۆ منداڵەکانی بکێشێت.

٢- موسڵمان پەیوەندی خزمایەتی دەپارێزێت لەگەڵ کەسە دورە پەرێزەکانی.

٣- موسڵمان بەنەرمی مامەڵە لەگەڵ گەداو سواڵکەرو دەکات و بەسوکی سەیریان ناکات.

**شیکارێکی گونجاو بۆ ئەم دەستەواژانە بکە:**

١- مرۆڤی ڕێزدار بەپێی پێویست دەنگ بەرزدەکاتەوە.

٢- مرۆڤی ڕێزدار ناوبەناو دەست لەبەرژەوەندی خۆی هەڵدەگرێت.

٣- جێنشین عومەری کوڕی عەبدولعەزیز فەرمانی کرد بۆماوەی سێ ڕۆژ ئەسپێك لەحەوانەوەدا بێت و ماندوو نەکرێت.

**وەڵامی گونجاو لەنێو کەوانەکاندا بۆ بۆشاییەکان هەڵبژێرە:**

١-پێغەمبەری خودا.......... چاوەکانی لەدەستدا لەتاو لەدەست چونی کوڕەکەی.

(یوسف ـ یەعقوب ـ شوعەیب)

٢- موسڵمان خاوەن ....... لەبەخشین بەسەر بێ باوکاندا. (دڵێکی نەرمە ـ دڵێکی ڕەقە)

٣-.......... لەبەندکردنی باڵندەو خۆراك لێگرتنەوەی. (ڕێدەگرم ـ گوێی پێنادەم)

**ستوونی یەکەم بەبڕگەی گونجاو لەستوونی دووەمدا بگەیەنە:**

| | |
|---|---|
| ١- سۆزو بەزەیی لەمرۆڤدا دەبێتە هۆی بەهێزکردنی | لەگەڵ قوتابیان |
| ٢- موسڵمانی ڕێزدار لەگەڵ کەسانی دیکەدا دەدوێت | هزرو هەستی هاوکاری |
| ٣- مامۆستا بەهەستێکی باوکانە یان دایکانە دەجوڵێتەوە | بەزمانی شیرینی پاراو |

## وانەی نۆیەم

# پەندو ئامۆژگاری لەچیرۆکی پێغەمبەراندا
# ئارامگرتن و خۆگری ئەییوب پێغەمبەر (دخ)

خودای میهرەبان دەفەرمویت:((وَأَيُّوبَ إِذْ نَادَى رَبَّهُ أَنِّي مَسَّنِيَ الضُّرُّ وَأَنْتَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ (٨٣) فَاسْتَجَبْنَا لَهُ فَكَشَفْنَا مَا بِهِ مِنْ ضُرٍّ وَآتَيْنَاهُ أَهْلَهُ وَمِثْلَهُمْ مَعَهُمْ رَحْمَةً مِنْ عِنْدِنَا وَذِكْرَى لِلْعَابِدِينَ (٨٤))) .(٨٣-٨٤ الانبیاء). ئەییوب (د.خ) یەکێکە لەپێغەمبەرە بەڕیزەکانی خودا کەناویان لەقورئاندا هاتووەو بۆتە نمونەی بالا لەئارامگرتن لەبەردەم تاقیکردنەوەی قورسی خوداییدا، ئەییوب لەنەوەی یوسفە(سلاوی خودای لێبێت) هاوسەرێکی دڵسۆزو بەڕێزی هەبوو لەناوچەی (حەوران) دەژیان. خودا بەخششی زۆری پێیان دابوو لە کوران و کچان، زەوی بەپیتو سامانو بەروبوم. جگە لە ئاژەڵی زۆری هەمەچەشن. سەرباری ئەوەی پلەوپایەی بەرز کردەوە تا کردیە پێغەمبەر. بەخششەکانی خودای لەخزمەتی میوان وهەژاراندا خەرج دەکردەوە، بەشێوەیەك دەگێڕنەوە، جەمێکی نەدەخوارد مەگەر هەژارێك، میوانێك لەگەڵی بخواردایە. هەردەم بانگەوازی چاکەی بەگوێی خەڵکدەداو رێگری خراپەی لێدەکردن.

خۆشەویستی ئەییوب وخێزانی چوە دڵی خەلکیەوەو خۆ بەزل نەزانینو کارکردن ببوە سیمای دیاریان هەرچەندە تواناو دەسەلاتیان هەبوو. لەم کاتە زێرینەدابوو خودای گەورە بەلاو تاقیکردنەوەی گەورەو گرانی بەدوای یەکدا بۆنارد. ئەوەبوو کارگەرێك بەهەڵەداوانو هاوارکردنەوە لەسەر کارەوە گەڕایەوە! گەورەم، ئەی پێغەمبەری خودا!

- ئەییوب(دخ): چی رویداوە، مەوەستە، بلێ!
- گەورەم: هاورێکانم، جوتیاران و شوانەکان هەموو کوژران، خوێنیان وەك رووبار جۆگەی بەستوە!.
- چۆن روویدا؟
- رێگرو پیاوکوژان، هەرکەسیان بەردەستکەوت کوشتیان و هەرچیان بۆبرا لەئاژەڵ بەتالان بردیان.

- **ئـەییوب(دخ)**: إنّـا للّـه وانّـا اليـه راجعـون. (هـەمووما‌ن مـوڵکی خـوداین و بـۆلای ئـەو دەگەڕێینـەوە)(ئەمـە زیکـری تایبـەت بەبـەڵاو توشـهاتە). هـەروەها فـەرموی: خـودای گـەورە ویستی وایە تاقیم بکاتەوە.

ڕۆژێك دوای ئەو کوشتارە بەهۆی هـەورە بروسکەوە کێڵگەیـەکی دانەوێڵەو کشتوکاڵیان گڕی گرت و یەکێك لەجوتیاران ئەم هەواڵە کتوپڕەی گەیاندە ئەییوب(د.خ).

**ئەییوب**: بۆ جل و بەرگت واشڕو سوتاوە، بلێ چی ڕوویداوە؟

**جوتیار**: ئەی پێغەمبەری خودا، ئاگر کەوتەوە، ئاگر!!

- چی ڕوویدا؟

- هەموو شتێك سووتا، ئاگر داباری، کێڵگەو ڕەزەکان سوتان...هتد.

لێرەدا هاوسەرەکەی **ئەییوب(دخ)** گوتی:

خودایە، ئەم هەموو بەسەرهاتە چی بوو؟

**ئەییوب(دخ)**: ئـارام بگـرە، ئـافرەت. بزانـە ئەمـە ویـستی خودایـە، تاقیکردنەوەیـە، سـەرجەم پێغەمبەران تاقیکراونەتەوە، دەستەکانی بەرزکردەوە بۆئاسمان و فەرموی: خودایـە: ئارامیم پێ ببەخشە، لێرەدا بەکارگەرو خزمـەت چیانی ڕاسپارد جێی بهێڵن بگەڕێنـەوە ماڵـەکانی خۆیان و بەدوای کاردا بگەڕێن.

هێندەی نەبرد، هێشتا شوێنەواری گڕو سوتان بە بەرچاوەوە بوو، کارەساتێکی دڵتـەزێن سـەری هەڵدا، ئـەویش مردنـی بەکۆمـەڵی منداڵـەکانی بوو کاتێك خانوویـان بەسـەردا ڕوخـا، ئەمەیان سەخت و دژواربوو بۆ ژیانی ئەییوب، بەڵام تاقیکردنەوەی دیکە لەجەستەی خودی ئەییوبدا بەرێوەیە، پێستی جەستەی دەبوە لیرو بەڵەك بەجۆرێك لەسەر ڕوومەتی دەردەکەوت خەڵکی دوریان لێدەگرت. تا وای لێهات، تەنها هاوسەری بە ئەمەکی لەلا مایەوە. بەم شێوەیە تـەنها مایـەوە دوای لەدەسـتدانی مـاڵ و ڕەزو بـاخ، تەندروسـتی خـۆیی و کۆچـی کتـوپڕی منداڵانی.

سـەرجەم تاقیکردنـەوەکان بـاوەڕو ورەی ئـەییوبیان پتـەوتر دەکـرد تەنانـەت دڵخۆشـی هاوسـەرەکەی دەکـرد کـەخۆڕاگربێت لەئاسـت ڕووداوەکانـدا، لەولایەشـەوە شـەیتان لـەرێی گومان بۆ دروستکردنەوە دەیویـست فریـوی بدات، دایبڕێت لەمتمانـەو پـشت بەخودابەسـتن. دوو دڵـی بکـات لەخۆشەویـستی خـودای میهرەبـان بـۆی، بـەڵام ئـەییوب تـا دەهـات بـاوەڕی بەهێزترو ئارامگری پتر دەبوو، کار گەیشتە ئەوەی توانای جەستەیی بۆ پەیداکردنی بژێوی

رۆژانــەی نــەما، بۆیــە هاوســەرەکەی ناچــار بــەکارکردن لەماڵانــدابوو، وزەو ورەی بــەرزی لەئەییوبەوە وەردەگرت. ژیانیـان رۆژ بـە رۆژ دژوارو سـەختتر دەبوو، تەنانـەت هاوسـەرەکەی ناچاری فرۆشـتنی پرچی بـوو، تانـانی پـیْ بکرِێـت بـۆ ژەمـی خـواردن. ئـەم کـارە ئـەییوبی نیگەران کردو پێی دڵگران بوو بەشێوەیەك لەهاوسەرەکەی زویر بوو.

هاوسـەرەکەی ئـەییوب(دخ) داوای لێـدەکرد لـەخودا بپارێتـەوە، تـا ئـەو دەردو ئـازارەی لەکۆڵ بکاتەوە، بەڵام ئەو هەرگیز سکاڵای لەباری تێکچوی تەندروستی نەدەکردو دەیگوت: خودا ئەوەی بەباش زانیوە بۆمن، ئارام دەگرم تا پاداشتم نەفەوتێت. بەڵام ئـەو بەفرۆشـتنی خێزانی بۆ پرچی خۆی زۆر دڵگران بوو، بۆیە رووی لـەئاسمان کردو گوتی: خودایـە، ئـەی بەئاگا لەحالی بەندەکانت، من توشی زیان بووم و تۆش میهرەبانتری، هـەموو روداوێك لـەژێر چاودێری و زانیـاری خۆتدایـە، ئێمـە لاوازیـن و تـۆش بەسـۆزو توانـای، خـۆت دەزانـی چـی باشەو لەبەرژەوەندی ئێمەدایە. قورئان لەم رووە دەفەرمویْ: ((وَاذْكُرْ عَبْدَنَا أَيُّوبَ إِذْ نَادَى رَبَّهُ أَنِّي مَسَّنِيَ الشَّيْطَانُ بِنُصْبٍ وَعَذَابٍ)) (﴿٤١﴾-ص).

ئا لێرەدا خودا فریشتەی بۆناردو سڵاوی خودای پێگەیاندو پێی گوت: داواکەت لای خودا وەرگیراو پاداشتی خۆراگرتنت بۆ نوسراوە، هـەروەها پێـی راگەیانـد: پـیْ بەزەویـدا بدەو، لەم ئاوە سازگارە جەستەت بشۆو لێی بخۆرەوە، پێستت لەبەڵـەکی رزگاری دەبێتو چاکدەبێتەوە بەفەرمانی خودا. قورئان دەفەرمویْ: ((ارْكُضْ بِرِجْلِكَ هَذَا مُغْتَسَلٌ بَارِدٌ وَشَرَابٌ ﴿٤٢﴾ وَوَهَبْنَا لَهُ أَهْلَهُ وَمِثْلَهُمْ مَعَهُمْ رَحْمَةً مِنَّا وَذِكْرَى لِأُولِي الْأَلْبَابِ ﴿٤٣﴾)) (﴿٤٢﴾-﴿٤٣﴾ص).

ئەییوبی پێشەنگی ئارامگران ئەمەی ئەنجامداو خودا کردیە شیفای، لێرە بەدواوە رەوشـەکە گـۆڕا، تەندروسـتی ئـەییوب(دخ) بـەرەو باشـی دەرۆیـشت سـەرزەویەکان بوژانـەوە، بـەروبوم جـارێکی دیکـە دەرکـەوت، سـامانو دارایـی گەشـەی کـردەوە. هاوسـەرەکەی کـە بـەهۆی نیگەرانی ئەییوبەوە لێی دوورکەوتبۆوە گەڕایەوە بەشێوەیەك کە ئەییوبی بینی نەیناسیەوە، تەندروستیەکی باش! پێستێکی خاوێن، روخسارێکی نویْ و گەش، بۆیە هەواڵی ئەییوبی لیْ پرسی، ئەویش لەوەلامدا گوتی: من ئەییوبم.

ـ بەسەرسوڕمانەوە:تۆ ئەویت؟ چونکە کاتێك لێی دوورکەوتبۆوە، کەسێکی لاوازو نەخۆش و روخسار گۆڕاو بوو. بۆیە ئەییوب (د.خ) داوای لەویش کرد لەهەمان سەرچاوەی ئاو بخواتەوەو ئەندامەکانی لەشی بشوات، بەم شێوەیە هەردووکیان گەڕانەوە تافی لاوێتی و خودای میهرەبان سەر لەنوێ منداڵی پێ بەخشینەوە. ئەمە بوو ئەنجامی ئارامگری و سوپاسگوزاری خودا، پاداشتی پشوو درێژی و خۆراگری لەبەردەم تاقیکردنەوەو بەڵادا.

## پەند لەم چیرۆك و بەسەرهاتە

لەوردبوونەوەو رامان لەم چیرۆکە قورئانیە ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کە ئارامگری لەسەر بەڵاو ئاستەنگ، هۆکارو رێرەوە بۆدەستخستنی رەزامەندی و لێخۆشبونی خودا. کەواتە پێویستە مرۆڤی باوەڕدار خۆڕاگرو پشوو درێژ بێت لەبەردەم تاقیکردنەوەی خودایيدا.

## گفتوگۆ

١- ژیانی ئەییوب(د.خ) پێش لەتوشبون بەنەخۆشی و تەنگژە چۆن بوو؟
٢- ئەو بەسەرهات و گرفتانە چی بوون هاتنە رێی پێغەمبەری خودا ئەییوب(د.خ) ؟
٣- شەیتان لە چ رێگایەکەوە هەوڵی سەرپێچیکردنی بە ئەییوب دا؟ ئەی کاردانەوەی ئەییوب چی بوو؟
٤- دوای ئەوەی ئەییوب(د.خ) ئەنجامی ئارامگرتنی بینی. ژیانی چۆن گۆڕدرا؟

وانەی دەیەم

## ڕۆژو گرتن و حوکمەکانی

خودای گەورە دەفەرموێت:

((يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ (١٨٣) أَيَّامًا مَعْدُودَاتٍ فَمَنْ كَانَ مِنْكُمْ مَرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِنْ أَيَّامٍ أُخَرَ وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ فَمَنْ تَطَوَّعَ خَيْرًا فَهُوَ خَيْرٌ لَهُ وَأَنْ تَصُومُوا خَيْرٌ لَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ (١٨٤) شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِي أُنْزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ هُدًى لِلنَّاسِ وَبَيِّنَاتٍ مِنَ الْهُدَى وَالْفُرْقَانِ فَمَنْ شَهِدَ مِنْكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ وَمَنْ كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِنْ أَيَّامٍ أُخَرَ يُرِيدُ اللَّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ وَلِتُكْمِلُوا الْعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُوا اللَّهَ عَلَى مَا هَدَاكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ (١٨٥) )) (١٨٣-١٨٥ البقرة)

## پێناسەی ڕۆژو

بریتییە لە: خۆگرتنەوە لەخواردن و خواردنەوەو جووتبوون، لە بانگی بەیانیەوە تا خۆرئاوا.

## گرنگی ڕۆژو

سەبارەت بە گرنگی مانگی ڕەمەزان، ئەبو هورەیرە لەپێغەمبەرەوە (د.خ)دیگێڕێتەوە: (مَن صامَ رمضان ايماناً واحتساباً غفر له ماتقدم من ذنبه ومن قام ليلة القدر ايماناً واحتساباً غفر له ماتقدم من ذنبه )(بوخاری ڕیوایەتی کردووە).

## جۆرەکانی ڕۆژو

١- ڕۆژوی فەرز، واتە ڕۆژوی مانگی ڕەمەزان.
٢- ڕۆژوی خۆبەخشانە کە بەناوبانگترینیان:
ﺉ - ڕۆژوی ١٠ی مانگی موحەڕەم (عاشورا)(*)
ب - ڕۆژوی ٩ی مانگی زیلحە حجة(عرفة) ڕۆژی حەج.
ت - ڕۆژوی دووشەممان و پێنجشەممان لەهەفتەدا.
پ - ڕۆژوی ١٣، ١٤، ١٥ی هەرمانگێکی (قەمەری).
ج - ڕۆژوی (شەشەڵان) شەش ڕۆژ لەمانگی شەووال.
ح - ڕۆژوی مانگی شەعبان.
خ - ڕۆژوی مانگی (موحەرەم).

## گفتوگۆ

١- پێناسەی ڕۆژو بکە؟ ٢ - ڕۆژوی خۆبەخشانە کامانەن؟

* ڕۆژوی عاشورا هۆکارەکەی ڕزگاربوونی موسا پێغەمبەرە(د.خ) لەپەلاماری فیرعەون کە لەوڕۆژەدا لەدەریای سووردا خنکا.

## مەرجەکانی پێویستبونی رۆژو

ئ - ئیسلامبوون.

ب - ژیری و ئاوەز. بۆیە شێت رۆژوی لەسەر نیە.

پ . پێگەیشتویی(بلوغ). چونکە مەبەست گوێڕایەڵ بوونەو منداڵیش ئەرکی ئەم کارەی لەسەر نیە.

## مەرجەکانی بەرۆژوبوون

١- تەندروستی و لەش ساغی، خودا دەفەرموێت: (( وَمَنْ كَانَ مَرِيضاً أَو على سَـفَرٍ فَعِـدَّةٌ مِن أَيّامٍ أُخَر ))(١٨٥-البقرة)

٢- نیشتەجێی. واتە رێبوار نەبێت.

٣- بۆ ئافرەتان(لەسوڕی مانگانەو بێنوێژی دوای منداڵبوون)یشدا نابێت.

## سوننەتەکانی رۆژو

١- پارشێوکردن. پێغەمبەر(د.خ) دەفەرموێت: ((تَسَحَّرُوا فَإِنَّ في السُّحورِ بركةً)).

٢- دواخستنی پارشێو بۆ نزیکی بانگی بەیانی و پەلەکردن لەبەربانگ کردنەوەدا، هەر کەبانگی دا.

٣- بەربانگ کردنەوە بەچەند دەنکە خورمایەك، یان ئاو.

٤- دوعـاکردنی کـاتی بـەربانگ، پێغەمبـەر (د.خ) لـەکاتی رۆژوشـکاندندا، دەیفـەرموو: ((ذهبَ الظَمأُ وابْتَلَّتِ العروقُ، وثبتَ الأجرُ إنْ شاءَ الله تعالى)).

## ئەو رەفتارو هەڵوێستانەی ڕۆژو دەشکێنن یان لەکەداری دەکەن

بەم ئاکارو هەڵوێستانەی خوارەوە ڕۆژو یان بەتاڵ دەبێتەوە یان لەکەدار دەبێت: لەئاین پاشگەزبوونەوە، ڕودانی بێنوێژی بۆ ئافرەت، خواردن و خواردنەوەو خۆرشاندنەوە، چونە ناوەوەی هەرتەنێك لەرێی بۆشاییە ئاساییەکانەوە بۆناو لەشی مرۆڤ ، ئەنجامدانی کاری سیکسی، هەموو ئەمانە ڕۆژو بەتاڵ دەکەنەوە گەر بەئاگاییەوە ئەنجامدران، لەوانەش کەرۆژو لەکەداردەکەن زیادە ڕەوی لەبەرکارهێنانی بۆن و ئاو لەدەم وەردانی زیاد لەپێویست.

### گفتوگۆ

١- مەرجەکانی پێویستبونی ڕۆژو چیە؟

٢- ئەو ئاکارانەی دەبنە هۆی تێکدان و بەتاڵکردنەوەی ڕۆژو کامانەن بیانژمێرە؟



## وانەی دوانزەم

# خۆپاراستن لەمەترسیەکانی مین

مامۆستای زمانی کوردی قوتابیانی راسپاردبوو کەسەبارەت بەمین وزیان ومەترسیەکانی بۆسەر هاولاتیان دارشتنێك بنوسن وهەلوێست ورای ئاینی ئیسلامیشی لەسەر رونبکەنەوە، بۆیە داوای لە سروە کرد ئەو بابەتەی کەئامادەی کردوە لەم روەوە، بیخوێنێتەوە بۆ هاورێیانی کە بەم شێوەیە بوو:

لەئەنجامی گۆرانکاریە جیهانیەکان ومەترسیە بەر بلاوەکان، دۆزی مینی زەمینیش روبەرێکی فراوانی لەو مەترسیانە داگیرکردووە کەکاریگەریەکی ئالۆزو، زیان و مەترسی لەسەر ژینگەی مرۆیی بەجێهێشتوە، بەتایبەت دوای ئەوەی ئامارەکان ژمارەیەکی ترسناکیان لەزیانە مرۆییەکان راگەیاندوە کە بە ملیۆنەها کەس مەزەندە کراوە، ئەمە سەرباری زیانە ئابوریەکان. هەربۆیە کۆرایەکی جیهانی دژ بەم دیاردەیە سەری هەلدا وچەندین چالاکی نێودەولەتی لەخۆگرت سەبارەت بەمەترسیەکانی مین وهەلمەتی گشتی بۆ قەدەغەکردن وریگرتن لەبەکارهێنانی.



هەلوێستی ئاینی ئیسلامیش سەبارەت بەو دۆزە روونەو هەرگیز ڕێنادات جەنگ دژی مرۆڤە سڤیلەکان بەرپابکرێت، پێغەمبەرمان (د.خ) فەرمویەتی **(لا ضرر ولا ضرار)** واتە: ڕێگەنادرێت بەزیانکردن وزیانگەیاندن. هەروەها دەگێڕنەوە کە(عومەری کوڕی خەتتاب) کاتێك بۆشام دەچوو بینی هەندێك لەبەر خۆر ڕاگیراون وڕۆن دەکرێت بەسەریاندا، گوتی: ئەمانە چین؟ گوتیان: ئەمانە باجیان نەداوە. عومەر گوتی پێغەمبەر(د.خ) فەرمویەتی: **((لا تُعَذبوا الناس، فان الذين يعذبون الناسَ في الدنيا، يعذبهم الله يومَ القيامة))** واتە: پێغەمبەر(د.خ) ئازاردانی ئادەمیزادی قەدەغەکردوە، دەفەرموێت: ئەو کەسەی مرۆڤێك ئازاربدات خوداش لەرۆژی دواییدا ئەو ئازاردەدات. مامۆستا ئافەرینی لەسروە کردو، قوتابییەکی تریش بەناوی سۆزان داوای بەشداریکردو گوتی: من دوو تەوەرم لەسەر ئەم بابەتە ئامادەکردوە، کەئەمانەن:

**١- وشیارکردنەوەی خەڵك سەبارەت بەمەترسیەکانی مین:**

پێویستە مرۆڤی موسڵمان خۆیی وکەسانی تریش هانبدات بۆ دورکەوتنەوە لەناوچە مینرێژکراوەکان، ئەمەش سۆزو بەزەیی دەگەیەنێت بەرانبەرو خۆو خەڵکیش ودەبێتە مایەی بەزەیی خودای پەروەردگاریش بۆیان، پێغەمبەرمان(د.خ) دەفەرموێت: **((لا يرحم الله من عباده إلاّ الرحماء))**.










**٢- وشیارکردنەوەی کۆچەران وڕێبواران:**

ئەمەش بەزۆری ئەرکی پێشنوێژی مزگەوتەکانی گوندەکانە کەرێبواران وکۆچبەران ڕێیان تێدەکەوێت لەگەشتەکانیاندا، چونکە ئەوان شارەزای ئەو کێڵگە مینانە نین کە لەو ناوچانەدان. بەمەش گیانیان لەو مەترسیانە پارێزراودەبێت، ئەو ڕێنماییانەش دەبنە هۆی دەستکەوتنی پاداشت بۆ ئەو زانایانە. هەروەك پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێت: ((من دعا الی هدی کان له من الاجر مثل اجر من اتبعه، لا ینقص ذلك من اجورهم شيء )).

ئەوانەی ڕەفتاریان باش نیە، بەپێی شەریعەتی ئیسلام دەکرێت ڕەفتاریان چاکبکرێتەوە، بۆیە دەرگای تۆبەو گەڕانەوە هەردەم والآیە، تۆبەش نیشانەی گۆڕینی ڕەفتارو وازهێنانە لەسەرپێچی، وەك پێغەمبەر(د.خ) فەرموویەتی: ((خالق الناس بخلق حسن واتبع السيئة الحسنة تمحها)).

بۆیە ئەگەر بینیمان کەسێك مامەڵە لەگەڵ چەك وتەقەمەنی دەکات ودەچێتە ئەو جێیانەی مینرێژکراون، دەبێت ڕێنوێنی بکەین وڕێگری لێ بکەین لەو کارانەی دەبنە هۆی زیان گەیاندن بەخۆی وکەسانی دیکە.

**دوای ئەوەی سوپاسی هەردوکیانی کرد، مامۆستا گوتی:**

لەم بوارەدا چەندین ئاکاری تری پیرۆز هەن پێویستە ئاگاداریان بین، وەك ئەرکی ئاینیمان، لەوانەش:

١- بەکارنەهێنانی چەك وتەقەمەنی لەشوێنە گشتیەکاندا.

٢- دوورکەوتنەوە لەکێڵگەکانی مین وپاشماوەی سەربازگەو شوێنەوارە جەنگیەکان.

٣- پاراستنی نیشانەکانی ئاگاداری ووشیارکردنەوە لەکێلگەکانی مین وتەقەمەنی.

٤- هاوکاریکردنی تیمەکانی مین هەڵگرەوە.

٥- بەکارنەهێنانی تەقەمەنی لەراوی ماسیدا، بەڵکو تۆرو قولاپ بەکاربێن.

## چالاكی

بەهاوكاری مامۆستا، قوتابییان هەڵدەستن بەئامادەكردن ونمایشكردنی پۆستەرو بڵاوكراوەی سەردیوار سەبارەت بەمەترسیەكانی مین. هەروەها ڕێكخستنی چەند دیمەنێكی نواندن دەربارەی چۆنیەتی دەربازبوون لەكێڵگەی مین، كاتێك بێ ئاگایانە تێی دەكەوێت.






# وانەی سیانزەم

## حەرام بونی دیاردەی بەرتیلکاری

پێغەمبەرمان (د.خ) دەفەرموێت: **(لعنَ اللهِ الراشيَ والمرتَشي والرائش)** ترمزی دەیگێرێتەوە.

واتە: بەرتیل دەرو وەرگری ورێکخەری نێوانیان لەبەر نەفرینی خودا کەوتوون.

| ژ | وشە | واتا |
|---|---|---|
| ١ | **لعن** | لەسۆزو رەحمی خۆی دووریخستۆتەوە (نەفرینی کردوە) |
| ٢ | **الراشي** | بەرتیل دەر |
| ٣ | **المرتشي** | بەرتیل خۆر |
| ٤ | **الرائش** | رێکخەری نێوانیان |

### پێناسەی بەرتیل:

بەو برە ماڵ وسامانە دەوترێت کەسێك دەیداتە دەسەلاتدارێك لە رێگەیەکی نادروستەوە بەمەبەستی وەرگرتنی یان زەوتکردنی مافی یان پلەوپایەی یاخود کاری کەسێکی دیکە بۆ خۆی. ئەم دیاردەیە حەرامە چونکە دادگەری لەناو دەبات، مافی خاوەن ماف دەفەوتێت، دەبێتە هۆی بڵاوبونەوەی گەندەڵی و شێرپەنجەی بێدادی، هەر بۆیە لەگشت ئاینەکاندا حەرام وقەدەغەکراوە. لە قورئانی پیرۆزیشدا بەچەندین ئایەت حەرامبوونی راگەیەندراوە وەك لەسورەتی (البقرة)دا هاتووە: (( **وَلَا تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ وَتُدْلُوا بِهَا إِلَى الْحُكَّامِ لِتَأْكُلُوا فَرِيقًا مِنْ أَمْوَالِ النَّاسِ بِالْإِثْمِ وَأَنْتُمْ تَعْلَمُونَ** )).(البقرة-١٨٨)

هەروەها لە فەرمودەی پێغەمبەری سەرورەریشدا (د.خ) ئاماژە بەحەرامێتی کراوە، وەك لەسەرەوە هاتووە.



## هۆكارەكانی حەرام بوونی بەرتیل

١- چونكە بەهۆیەوە بەشێوەیەكی ناڕەواو ناشایستە دەستكەوتێك بەدەست دێت وەك: بەخشین لەباج، یان (بۆ دەرچوونی كەمكردنەوە)، یاخود دەستخستنی گرێبەستی نایاسایی یان (بەنایاسایی).

٢- دەبێتە هۆی زەوتكردنی مافی كەسێكی دیكە: لەبواری هەلی كاردا، یان جێگرتنەوەی خاوەن مافێك.

٣- دەستخستنی پلەو پایەی گرنگ، بەتایبەتی كە شایستەی نەبێت.

## چارەسەری ئەم دیاردەیە:

١- دابینكردنی بنەماكانی دادگەری لەنێوان تاكەكانی كۆمەڵگەدا.

٢- دانانی كەسی شیاو بۆ پلەو پۆستەكان.

٣- سەروەربونی یاساو لێپێچینەوە لەو كارمەندو بەرپرسانەی بەرتیلخۆرن.

٤- بەرزكردنەوەی ئاستی هۆشیاری ئاینی وبەرپرسێتی لەبەردەم خودای باڵادەستدا. هەروەها بەرزكردنەوەی ئاستی رۆشنبیری تاكەكان، كەئەو دیاردەیە دژی دادگەری كۆمەڵایەتی وچینایەتییە.

## ((گفتوگۆ))

١- پێناسەی بەرتیل كاری بكە.

٢- بۆچی پێغەمبەرمان (د.خ) هۆشیاری داوە سەبارەت بە بەرتیل كاری؟

٣- هۆكارەكانی حەرامێتی بەرتیلكاری كامانەن؟

٤- بە ئایەتێكی قورئان ئاماژە بكە بۆ حەرامێتی بەرتیل.

٥- بەرتیل چەند روو بوارێكی هەیە، وەك ................!

٦- چۆن دەتوانین ئەم دیاردەیە قەڵاچۆ بكەین؟


هو الله الذي لا إله إلا هو
الله
الرحمن الرحيم الملك القدوس
السلام المؤمن المهيمن العزيز
الجبار المتكبر الخالق البارئ
المصور الغفار القهار الوهاب
الرزاق الفتاح العليم
القابض الباسط الخافض
الرافع المعز المذل السميع
البصير الحكم العدل اللطيف
الخبير الحليم العظيم الغفور
الشكور العلي الكبير الحفيظ
المقيت الحسيب الجليل الكريم الرقيب
المجيب الواسع الحكيم الودود المجيد
الباعث الشهيد الحق الوكيل القوي المتين
الولي الحميد المحصي المبدئ المعيد المحيي
المميت الحي القيوم الواجد الماجد الواحد الأحد الصمد القادر المقتدر المقدم المؤخر الأول الآخر
الظاهر الباطن الوالي المتعالي البر التواب المنتقم العفو الرؤوف مالك الملك ذو الجلال والإكرام المقسط الجامع
الغني المغني المانع الضار النافع النور الهادي البديع الباقي الوارث الرشيد الصبور

# وانەی چواردەم

## رامان لەدروستکراوانی خودا

ئەقڵ وئاوەز لەبەخششە گەورەکانی خودای میهرەبانن بۆ مرۆڤەکان، سەرچاوەن بۆهزرو وەرگرتنی زانست وزانیاری وناسینی کرۆکی راستیەکان، هۆکاریشن بۆ گەیشتن بەنهێنیەکانی جوانی بونەوەر. خودای گەورە دەفەرموێت:(( إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لَآيَاتٍ لِأُولِي الْأَلْبَابِ ))(١٩٠-آل عمران).

مرۆڤی بڕوادار هەمیشە بیردەکاتەوەو ئەقڵ دەخاتە کار بۆ ناسین وپەیبردن بەدروستکراوەکانی خودای گەورەو دەگاتە ئەو راستیەی کە بوونەوەرو گشت دروستکراوان بەدیهێنەرێکیان هەیە، ئەویش (الله)یە.



هەروەها نیعمەتی چاو بە کاردێنێت بۆ بینینی سروشتی جوان ورەنگین، ئەو چاوەی وەك کامێرایەکی بێ ئەرك لەچرکەیەکدا هەزاران وێنەو دیمەن تۆمار دەکات.

نهێنیەکی دیکەی بەدیهێنراوی خودای گەورە لەمرۆڤەکاندا ئەوەیە، لە یەکنەچونی نەخشەی رەگ ودەمارەکانی پەنجەی مرۆڤ -پەنجە مۆر- هیچ کەسێك بە کەسێکی دی لەسەر زەویدا.

لەلایەکی دیکەوە جوانیو جیاوازی ڕەنگ وتام وبۆن لەنێو بەروبوومەکاندا کەلەیەك خاك وبەیەك ئاوو هەواش پەروەردە دەبن، جێی سەرنج وتێرامانە، خودای گەورە دەفەرموێت:

(( وَهُوَ الَّذِي أَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ نَبَاتَ كُلِّ شَيْءٍ فَأَخْرَجْنَا مِنْهُ خَضِرًا نُخْرِجُ مِنْهُ حَبًّا مُتَرَاكِبًا وَمِنَ النَّخْلِ مِنْ طَلْعِهَا قِنْوَانٌ دَانِيَةٌ وَجَنَّاتٍ مِنْ أَعْنَابٍ وَالزَّيْتُونَ وَالرُّمَّانَ مُشْتَبِهًا وَغَيْرَ مُتَشَابِهٍ انْظُرُوا إِلَى ثَمَرِهِ إِذَا أَثْمَرَ وَيَنْعِهِ إِنَّ فِي ذَلِكُمْ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ )) (الانعام-٩٩).



لەلایەکی ترەوە بەتێرامان لەجیهانی باڵندەو بەرواز یان ڕەنگی پەڕو باڵیان، چریکەو ئاوازی هەندێکیان، خۆراك وهێلانەو زاو زێیان، کۆچکردن وگەرمیان وکوێستان کردنیان، سەر دەسوڕمێ ودەسەڵاتی بێسنوری خودا دەردەکەوێت.

دیسان بەورد بوونەوە لەپێکهاتەو جووڵەی مێروەکان وکارکردن وبەرهەمی هەندێکیان وەك مێش هەنگ وشانەو خانەکانیان، یاسای کارو نەخشەیماڵیان، ڕۆژی وحەوانەوەیان گۆشەیەکی دیکە لەنهێنی ووردەکاری لەبەدیهێنانیاندا دەبینی، کە گەواهی دەدات لەسەر دەسەڵاتی خودای گەورە کەدەفەرموێت: ((هَذَا خَلْقُ اللَّهِ فَأَرُونِي مَاذَا خَلَقَ الَّذِينَ مِنْ دُونِهِ بَلِ الظَّالِمُونَ فِي ضَلَالٍ مُبِينٍ)).( ١١-لقمان)

جیهانی دەریاو ئۆقیانۆسەکان فراوانترو پڕنهێنی ترە، هەزاران جۆری زیندەوەر وژیان بەسەر بەردنیان وخواردن وهەناسەدانیان وپێکەوە ژیانیان. ئەوەش پڕە لەواتای هاوسەنگی ودەسەڵاتی بەدیهێنەری بوونەوەر.



کەسەر هەڵدەبڕی وسەیری ئاسمانی شین ورازاوە بەسەدان هەزار ئەستێرەی گەورە دەکەیت کەهەمووی لەجووڵەیەکی ڕێکخراودایە بەیاسا، بەفەرمانی خودای گەورەو بەپێی چەمکی یاسای کێشکردنی هاوسەنگ، هاتنی شەوو ڕۆژ، تیشکی پڕ خێری خۆر.......هتد. ئەمەش وانەیەکی دیکەیە لەدەسەڵاتی بێ پایانی خودای بەدیهێنەر.

((وَآيَةٌ لَهُمُ اللَّيْلُ نَسْلَخُ مِنْهُ النَّهَارَ فَإِذَا هُمْ مُظْلِمُونَ (٣٧) وَالشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍّ لَهَا ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ (٣٨) وَالْقَمَرَ قَدَّرْنَاهُ مَنَازِلَ حَتَّى عَادَ كَالْعُرْجُونِ الْقَدِيمِ)) (٣٧-٣٩يس)

ئەمانەو سەدان بەڵگەی تریش جێی سەرنج ورامانن لەسەر دەسەڵات ویاسای سەرسورهێنی خودای بەتوانا: ((هَلْ مِنْ خالقٍ غيرُ الله)).

## دروستکراوێکی سەرسورهێنەر

باوکی سەردار ویستی سەرنجی کورەکەی رابکێشێت بۆ ژیانی ئەو مێرولانەی لەسەر ڕێگای گوندەکەیان بینی، بۆیە لەوەڵامی پرسیارێکیدا گوتی: بژێوی ئەو مێروانە زۆر جێی رامانە، ئەوان ماوەیەکی زۆر دەڕۆن وڕێگای دوور دەبڕن تا چەند دەنکە گەنمێك کێشدەکەنە کونەکەیان وپاشەکەوتی دەکەن بۆ ڕۆژانی سەرماو سۆڵ. خۆ ئەگەر گومانی سەوز بونیان لەهەر دەنکە گەنمێك کرد دووکەرتی دەکەن هەتا نەڕوێت، هەر دەنکێکیش شێ وتەڕی پێوەبێت لەبەرهەتاو هەڵیدەخەن تا وشك ببێتەوە.

سەردار گوتی: بەڕاستی جێی رامان وسەر سوڕمانە، جیهانێکی سەیریان هەیە.

باوکی گوتی: بەڵێ کوڕم، دروستکراوانی خودا جۆراوجۆرن وتێگەیشتنیان رامان ولێکۆلینەوەی دەوێت بەئەقڵ وهۆش وبەئامێری زانستی.



## پرسیار

١- ئایەتێك بێنەرەوە هاندەربێت بۆ بیرکردنەوە لەدروستکراوانی خودا.

٢- بەئایەتێکی دیکە بیسەلمێنە کەبەروبومەکان جوان ورەنگینن.

٣- بەڵگە بەئایەتی قورئان بێنەرەوە لەسەر ئەوەی مانگ وخۆر دوونیشانەن لەسەر دەستەڵاتی خودا.

**نیشانەی (راست یان هەڵە) بۆ ئەم رستانە دابنێ.**

١- توانای وێنە تۆمارکردن لەچاوی مرۆڤدا لەهەستیارترین کامێرا بەهێزترە.

٢- نەخشەی رەگ ودەماری پەنجەی زۆربەی مرۆڤەکان لەیەك دەچێت.

٣- باڵندەکان لەکۆچکردنندا ئامانجیان نیەو بێهودە دەفڕن.

**بەوشەکانی نێو کەوانەکان ئەم بۆشاییانەی خوارەوە پڕبکەرەوە.**

١- مێش هەنگ لەدروستکردنی خانەکانیدا ............

( بێ بەرنامەیە، بەنەخشەی ئەندازەیی کاردەکات)

٢- بەهەمەجۆری بەرو بومەکان گشت جۆرە تام وچێژەکان بۆ مرۆڤ............

( هاوسەنگە، دەستەبەرە)

٣- پڕبەهاترین جۆری یاقوت ومەرجان لە........ دەست دەکەوێت.

( کارگەکان، قوڵایی دەریادا)

## زانیاری گرنگ

١- ئەستێرەکان هەموو لەجووڵەدان وجووڵەکانیان جیاوازە.

٢- زمانی مرۆڤ هەربەشێکی بۆ چێژی تامێکی جیاوازە لە(شیرین وترش وتاڵ)

٣- جیهانی زیندەوەران لەئاژەڵ وباڵندەو گیانەوەری ئاوی کەمتر نیە لەجیهانی ئێمەی مرۆڤ. وەك لە قورئاندا هاتووە:(( إِلَّآ أُمَمٌ أَمْثَالُكُمْ......))الانعام 38 .

## ڕامان

لەزیرەکی مێش هەنگ ڕامام کەبەهۆی ژماردنی خولخواردنیەوە کەدوور کەوتۆتەوە، دەزانێت چەند ماوەی بڕیوە یان چەند دوورە لە شانەکەی.

## چالاکی

١- زانای فەرەنسی (جاك کوستو) دۆزیەوە کە دوو دەریا هەن ئاویان تێکەل نەبوەونابێت لەبەیەك گەیشتندا. قورئان دەفەرموێت: ((مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ (١٩) بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لَا يَبْغِيَانِ)) (١٩-٢٠ الرحمن). لێرەوە دەسەڵات وتەحەدداى خودایی دەردەکەوێت.

٢- کاتێك باڵندەیەکی دایك خۆراك بەدەنوك وقاچەکانی دەباتەوەو دەیخاتە ناودەمی جوجەڵەکانیەوە تاگەورەیان دەکات. نیشانەیە لەسەر نیگاو ڕێنمایی خودا بۆدروستکراوەکانی. ئەمەش ڕامانی دەوێت.



# وانەی پانزەم

## ئاشتەوایی نێوان خەڵك



### مرۆڤ وئاشتی:

سروشتی مرۆڤ لەسەر راگرتنی پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان دارێژراوە، لەسەر بنەمای توندو تۆڵی ودوور لەناکۆکی ویەکتر سرینەوە کەدەبنە هۆی جیاوازی وسەرهەڵدانی کێشەو دوشمنایەتی، لەگەڵ ئەوەشدا دابڕان وناکۆکی وکێشە بەئاشتەوایی وراگرتنی شەرو لەچاڵنانی هۆکارەکانی لەئاینی ئیسلامدا رێ وشوێنی بۆدانراوە، چارەسەری لەسەر بناغەی برایەتی باوەڕەوە دەستنیشانکراوە بەئایەتی:((إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ))(١٠- الحجرات)، بەگەڕانەوە بۆفەرمانی خوداو فەرمودەی پێغەمبەر (د.خ) کەتێیدا زیادەڕەوی وستەم قەدەغەیە.

خودا دەفەرموێت: ((لَا خَيْرَ فِي كَثِيرٍ مِنْ نَجْوَاهُمْ إِلَّا مَنْ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوْ مَعْرُوفٍ أَوْ إِصْلَاحٍ بَيْنَ النَّاسِ وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ ابْتِغَاءَ مَرْضَاتِ اللَّهِ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا)) (النساء- ١١٤).

## هۆكاری كێشەو ناكۆكیەكان

هەندێك لەو هۆكارانەی ڕێخۆشدەكەن بۆسەر هەڵدانی كێشەو ناتەبایی وئاینی ئیسلام ڕێگرییان لێدەكات، ئەمانەن:

١- **جیاوازی:** زۆرجار جیاوازی لەبۆچون وراڤەكردنی دەق وتێگەیشتن لێی بۆتە هۆی ئەوەی موسڵمانان نارێك بن وریزەكانیان دزەی لێوەبكرێت لەلایەن ناحەزانەوە بۆتێكدانیان، بۆیە پێغەمبەری میهرەبان(د.خ) لەكاتێكدا جیاوازی كەوتە نێوان بەشێك لەهاوەڵان لەسەر لێكدانەوەیان بۆ (قەزاوقەدەر) فریاكەوت وپێی فەرمون: ((**أبهذا امرتُم او مانُهيتُمْ عَنْ هذا، إنَّما أهلكَتِ الأُمَمُ قبلكُمْ في هذا**)). واتە: **((ئایا فەرمانتان پێكراوە یەكتر قبوڵنەكەن، ئایا پێتان ڕانەگەیەنراوە دوركەونەوە لەتێكدانی ریزەكانتان، نازانن كەنەتەوەو گەلانی پێش ئێوە بەهۆی ناكۆكی وكێشەوە تیاچوون))**. ئەمە لەسەر ئاستی تاكیشدا هەر چارەیەو پێویستە پەیڕەو بكرێت.

٢- **كینەو قین:** دەردێكی كوشندەیەو دەبێتە هۆی لێكترازانی ڕیزو دروستبوونی دژایەتی بەرانبەر یەكدی.

٣- **پێشبركێی نادروست (شان لێكخزانی ناپەسند):** دەبێتە هۆی پەنابردن بۆهۆكاری نادروست ویەكدی سرینەوەو قبوڵنەكردنی بەرانبەر، ئەمەش كێشە دەنێتەوە.

٤- **پاوانكردنی مافی كەسانی دیكەو دەستدرێژی بۆسەر سامان وبەرژەوەندییان،** كەخاوەن بەرژەوەندی دێنێتە گۆو بەرگری لە خۆی دەكات وكێشە دروستدەبێت.

٥- **خۆسەپاندن:** واتە بەكەم گرتنی ڕای بەرانبەرو چەوساندنەوەی، كەناچاری دەكات بەرگری لەرای خۆی بكات و بونی خۆی بسەلمێنێت، لێردا ناحەزی پەیدا دەبێت.

٦- **زیادەڕەوی لەرەخنەی ڕوخێنەردا** :كەدەبێە هۆی برینداربونی هەستی كەسی بەرانبەرو وەرگرتنی هەلوێستی دژو دروستبونی كێشە.

٧- **پەرەسەندنی كێشە**:زۆرجاركێشەیەكی بچوك وسنوردار بەهۆی دەستێوەردانی لایەنی سێیەمەوە پەرە دەسێنێت و ئاگری فیتنەوئاشوب بەرپا دەبێت.بۆیە پێویستە دڵسۆزان وهۆشمەندان لێنەگەڕێن ئاشوب گەورەبێت ودواترچارەی سەخت و گران ببێت.

دوای ئەوەی هەندێك لەو هۆكارە نائاساییانەمان زانی پێویستە رۆڵی ژیری ودانایی بەهێزبكرێت لەكۆمەڵگەدا تابەر لەفراوانبونی كێشە بگرێت ولەجێی خۆیدا لەچاڵی بنێت وبرایەتی پارێزراوبێت. هەروەها گرنگە هۆشیاری تاك بەرزبكرێتەوە كەبەدوای تۆڵەسەندندا نەگەرێت وهەمیشە چاوپۆش ولێبوردەبێت, بوێر بێت پۆزش بكات كەبۆی دەركەوت هەڵەیە، لەگەڵ خۆی و دەرەوەی خۆیدا ئاشتەوایی بكات، كەسی وا لەلای خودای گەورە رێزدارە.

## جۆرەكانی ئاشتەوایی ئەمانەن:

أ – **ئاشتەوایی لەگەڵ خۆیدا،** بەوە دەبێت كۆتایی بێنێت بەشەرخوازی وسەرزەنشتی دەرونی خۆی بكات، دوری بگرێت لەكێشەو ناكۆكی لەگەڵ كەسانی دیكەدا.

ب – **ئاشتەوایی لەگەڵ دەرەوەی خۆیدا،** كەزیاتر لەرێی لایەنی سێیەمەوە دەبێت.

**ئەم جۆرە كێشەیەی خوارەوە بەچەند رێگەیەك چارەسەردەكرێ لەوانە:**

**یەكەم** ـ هاتنە پێشەوەی یەكێك لەلایەنەكان لەخۆیەوە بەداوای لێبوردن كردن لە لایەنەكەی دیكە هەرچەندە لایەنەكەی دیكە هەڵەش بێت، دەستپێشكەر لەلێبوردن باشترە، ئەی گەنجی هۆشیار پەلە بكە بۆ ئەوەی براوەی یەكەم بیت لەم حاڵەتەدا.

**دووەم** ــ گەراندنەوەی ماف بۆ خاوەن ماف، چونكە زەوتكردنی ماف خەڵكانی دیكە لەئیسلامدا حەرامە.

ج – ئاشتەوایی كردن لەلایەنی سێیەمەوە لەبەرئەوەی كێشەكە گەورەیە، ئەم جۆرە كێشەیە بەم شتانەی خوارەوە چارەسەردەبن:

١– دۆزینەوەی ئەو كەسەی كەهەڵدەستێت بە ئاشتەوایەكە، پێویستە كەسێكی ژیرو هێمن ولای هەردوولا وكەسانی دیكە پەسەند بێت.

٢– گوێگرتن لەخاڵە ناكۆكەكانی هەردوولا ودیاریكردنی خاڵە هاوبەشەكان بەئامانجی نزیك كردنەوەی هەردوو لایەنی ناكۆك.

٣– داخستنی هەموو دەروازەیەكی خراپ بەرووی كێشەكە، بۆیە پێغەمبەرمان (د.خ) بەم فەرموودەیە فەرمانمان پێ دەكات: (**ألا فسدّوا كلّ خَوّخة**).

٤– كردنەوەی هەموو دەرگایەكی خێر بەرووی ئاشتی وتەباییەوە.

٥- گواستنەوەی هەموو وتەیەکی چاك بۆ نزیککردنەوەی هەردوولاو رازیکردنیان، دانانی ئاشتەوایی لەسەر ئەم بنەمایە پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی: (ليس الكذاب الذي يصلح بين الناس فينوي خيراً او يقول خيراً).

٦- دوورکەوتنەوە لە توڕەبوون، پەروەردگار باسی باوەڕداران دەکات بەم سیفەتەو فەرموویەتی: ((الَّذِينَ يُنْفِقُونَ فِي السَّرَّاءِ وَالضَّرَّاءِ وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ))(آل عمران- ١٣٤).

٧- رەزامەندبوونی هەردوو لایەنەکە بەو رێکەوتنەی کە لەنێوانیان ئەنجام دراوە.

## ئەنجامی ئاشتەوایی

دوای ئەوەی کینەو ناحەزی دڵەکانی بەجێهێشت وگیانی تۆڵە وەلانراو توڕەیی هێوربۆوە، دەروونەکان پاکژو روخسارەکان ئارام دەبنەوە، دڵەکان بەرووی یەکدیدا دەکرێنەوە دۆستایەتی باڵدەکێشێتەوە بەسەر پەیوەندییەکاندا، ئەم ئایەتەی قورئانیش بەرجەستە دەبێت: (( وَلَا تَسْتَوِي الْحَسَنَةُ وَلَا السَّيِّئَةُ ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ فَإِذَا الَّذِي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ عَدَاوَةٌ كَأَنَّهُ وَلِيٌّ حَمِيمٌ ))(٣٤-فصلت).

## نموونەیەك لەئاشتەوایی

عومەری کوڕی خەتتاب بەتوڕەییەوە جارێکیان گوتی: من توڕەم لەفلان کەس.

بەو کەسە گوترا: بۆچی عومەر لێت توڕەیەو لێت بەقینە؟

ئەویش هاتە لای عومەرو پێی گوت: ئایا لەئیسلام جودا بومەتەوە؟

عومەر گوتی: نەخێر.

- ئەی کەتنێکم ئەنجامداوە، وا لێم بەقینی؟
- نەخێر، ئەوەش نیە.
- ئەی شتێکی دیکەم لەئایندا داهێناوە؟

- ئەوەشیان، نا.

- ئەی بۆچی لێم توڕەو بەقینی، ئەی گەورەی موسڵمانان؟ ئەی خودا نەیفەرموە:

((وَالَّذِينَ يُؤْذُونَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ بِغَيْرِ مَا اكْتَسَبُوا فَقَدِ احْتَمَلُوا بُهْتَانًا وَإِثْمًا مُبِينًا))(٥٨-الاحزاب).

تۆ ئازاری دڵمت داوە، خودا لێت خۆشنابێت.

بۆیە عومەر بەخۆیدا چۆوەو، گوتی: راست دەڵێت. سوێند بەخودا، نەجودا بۆتەوە، ونەکەتنی کردوە، نەو ......نە..........بمبورە ولێم خۆش بە، ئەوەندەی گوتەوە تا هاوەڵەکە گەردنی ئازادکرد.

## پرسیار

١- ئایەتێك بە بەڵگە بێنەرەوە کەتیایدا فەرمان بەئاشتەوایی وچاکەکاری کرابێت.

٢- ئایەتێکی قورئانی پیرۆز بنوسە کەتیایدا موسڵمان بەوە وەسفکرابێت دوورە لەتوڕەبوون.

٣- بەئایەتێکی قورئان بەڵگە بێنەرەوە کە دوای ئاشتەوایی نێوان ناکۆکەکان خۆشەویستی دروست دەبێت.

وەڵامی ئەم پرسیارانە لەراڤەی بابەتەکەوە وەردەگیرێت:

١- بەهێزترین ودرێژخایەنترین ئاشتەوایی کامەیە؟ شیبکەرەوە.

٢- چەند رێگایەك هەیە بۆچارەسەری کێشەی نێوان دوولایەنی ناکۆك بێ بەشداری لایەنی سێیەم، دوو لەو رێگایانە بلێ؟

٣- هەندێك جار بۆچارەسەری کێشەی نێوان دوولایەن، پێویست بەلایەنی سێیەم دەبێت، روونی بکەرەوە.

**نیشانەی ڕاست یان هەڵە بۆ ئەم دەستەواژانە دابنێ:**

١- مرۆڤ وا دروستبووە دورە پەرێز بژی نەك لەنێو كۆمەڵدا.

٢- ئیسلام هەموو ئەو كەلەبەرانە دادەخات كەكێشە لێیانەوە دزە دەكاتە نێوان خەڵك.

٣- كینەو قین دەبێتە هۆی ڕواندنی تۆی خۆشەویستی ودۆستایەتی.

**وەڵامی ڕاست لەنێوان كەوانەكاندا هەڵبژێرە:**

١- دەكرێت تورەیی خامۆش بكرێت، ئەگەر لە................دوربین.

(خۆ بەكەم زانین، كەللە ڕەقی)

٢- هەرچەند ................ كەم بێت، كێشەو پشت هەڵكردن كەم دەبێتەوە.

(جیاوازی، پێكەوە گونجان)

٣- ................... ڕێگایەكە بۆ نانەوەی كێشەو ڕووبەڕووبونەوە .

(پێشبڕكێی ناڕەوا، پێشبڕكێی ڕەوا)

# چالاكی

١- لەكاتی ڕوودانی كێشە لەنێوان خۆم وهاوڕێیەكمدا، هەوڵدەدەم درێژە نەكێشێت. ئەمە چۆن دەبێت؟

٢- گەر كەسێك بەمەبەستی تێكدانی نێوانمان لەگەڵ هاوڕێیەكم، لێم بێتە پێشەوە، پشتگوێی دەخەم وگوێی بۆناگرم.

٣- گەر ناكۆكیەك كەوتە نێوان دوو هاوڕێم، دەستبەجێ هەوڵی چارەسەری دەدەم.

٤- ئەگەر هاوڕێكەم پشتم تێبكات هەربەگومان وبەبێ ئەوەی تاوانم هەبێت، پێی دەڵێم كەئاگای لێبێت خۆی توشی گوناه نەكات وبزانێت من هەردلسۆزم بۆئەو.

# وانەی شانزەم

## زەکات وهەندێك لەحوکمەکانی

خودای گەورە دەفەرموێت: ((وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَارْكَعُوا مَعَ الرَّاكِعِينَ)).(٤٣-البقرة)

هەروەها دەفەرموێت: ((وَأَنفِقُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلَا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ وَأَحْسِنُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ )).(١٩٥- البقرة)



### پێناسەی زەکات:

ئەو بڕە ماڵەیە لەدەوڵەمەندان وەردەگیرێت ودەدرێتە هەژاران وئەو پۆلانەی لەقورئاندا دیاریکراون، بەپێی ڕێ وشوێنێکی تایبەت.

### مەرجەکانی پێویستبونی زەکات:

زەکات پێویست دەبێت لەسەر هەرکەسێك ئەم مەرجانەی تێدابن:

١- موسڵمانێتی: واتە کەسی دەوڵەمەند مەرجە موسڵمان بێت.

٢- سەربەستی: مرۆڤە موسڵمانەکە دەبێت سەربەست بێت، واتە کۆیلە نەبێت. بەواتای ئەوەی خاوەندارێتی پێبکرێت.

٣- ماڵ وسامانی لەئاستی (نصاب)دا بێت، واتە ئەو بڕەی لەشەرعدا زەکاتی لەسەر پێویست دەبێت وگەر لەو سنورە کەمتربوو زەکات دان نایگرێتەوە. ئەمەش بەپێی جۆری ماڵەکەیە، دراو، کشتوکاڵ، میوە، ئاژەڵ.....هتد، هەریەکەو بەئەندازەو بڕی جیا زەکاتی لەسەر پێویست دەبێت.

٤- تێپەربوونی ساڵێکی کۆچی بەسەر ئەو ئەندازەیەی زەکاتی لەسەر پێویست دەبێت، جگە لەکشتوکاڵ وبەروبومی میوە کەلەگەڵ دروێنە یان کۆکردنەوەی بەرهەمدا زەکاتی لێ دەردەکرێت. بڕی پێویست بۆ زەکات دانەکەش واتا(نصاب) دەبێت لەپێداویستیە سەرەکیەکانی خاوەنەکەی زیادبێت وەك پۆشاك وخۆراك وجێی حەوانەوە.

٥- خاوەندارێتیێ تەواوی ماڵەکەی هەبێت. ئەو ماڵ وسامانەی زەکاتی لێدەدرێت پێویستە ئەم مەرجانەی تیابێت:

١- گەشەکردن: واتە یان لەگەشەکردندا بێت یاخود شایستە بێت بۆ گەشەکردن وزیادبوون.

٢- ئەندازەو بڕی پێویست(النصاب): بەپێی جۆری ماڵ وکاڵاکە دەگۆڕێت.

٣- بەتەواوی لەخاوەندارێتی خاوەنەکەیدا بێت.

٤- ئەو بڕو ئەندازەیە لەپێویستیە سەرەکیەکان زیاد بێت.

٥- ئەو ماڵ ودارایی وکاڵایە قەرزی لەسەر نەبێت لەوکاتەدا پێویست بەدانەوەی بکات.

٦- ساڵی کۆچی بەسەردا تێپەربوبێت جگە لەبەروبوم وکشتکاری.

٧- ئەو ماڵ وسامانە لەدەستکەوتی حەڵاڵ بێت.

## ئەو جۆرانەی لەماڵ وسامان زەکاتیان لێدەردەکرێت

١- زێڕو زیو ودراو.

٢- ماڵی بازرگانی.

٣-ئاژەڵی ماڵی(حوشتر) گاو مانگا، مەڕو بزن.

٤- کشتوکاڵ وبەروبوم.

٥-کانزاو خشڵ.

٦-هەنگوین.

٧-پشك وچەکی بانکی ووەرگرتەی کریێ.

## ئەوانەی زەکاتیان پێدەشێت

خودای گەورە دەفەرموێت: (( إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَابِ وَالْغَارِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ وَابْنِ السَّبِيلِ فَرِيضَةً مِنَ اللَّهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ))(٦٠-التوبة)

١- هەژارەکان: ئەوانەن ماڵ وسامانیان نیەو دەرامەتیشیان نیە.

٢- ماڵنشین(مسکین): ئەوانەن ئەندازەی پێویستیان نیەو ئەوەی دێتە دەستیان بەشی بژێوی ناکات.

٣- کارمەندانی کۆکردنەوەی زەکات: ئەوانەن کەلەرێی میریەوە، یان دەستەی راسپێردراوەو کاری کۆکردنەوەو سەرژمێری وپاراستنی ماڵی زەکات ودابەشکردنیان خراوەتە ئەستۆ.

٤- دڵنەواکراوان، کەدوو بەشن:

أ- ئەو بێباوەڕانەی ئومێد دەکرێت بەدڵنەواییکردن بێنە ناو بازنەی ئیسلامەوە، یان بۆ خۆ پارێزی لەشەڕیان گەر توانای زیانگەیاندنیان هەبوو.

ب- ئەو توێژە لەموسڵمانان کەئاینیان لاوازە، زەکاتیان بدرێتێ بەئومێدی دابینکرنی بژێوی گونجاو بۆیان وئامادەبوونیان بۆ تێگەیشتن وفێربوونی ئیسلام.

٥- ئەوانەی گیرۆدەن: واتە لەکۆیلەو کەنیزەك کەسەربەست نین، زەکاتیان پێبدرێت بەئەندازەی دەربازبون لەکۆیلایەتی و وەرگرتنی ئازادی بۆبڕیاردان. ئەم چینە لەم سەردەمە نەماون.

٦- قەرزاران: بەڵام هەموو قەرزارێك ناگرێتەوە، مەرجدارە.

٧- لەپێناوی خودادا: لەرێی شکۆداری و بڵند راگرتنی بەرژەوەندی گشتی، داکۆکی کردن لە خاك و نیشتیمان.

٨- ئەوانەی لەنێو رێگادان: ئەو رێبوارانەی پارەیان لێ دەبرێت ودوورن لەجێی خۆیان، دەوڵەت زەکاتیان دەداتێ بەو ئەندازەیەی پێویستیان دابینکرێت تا دەگەرێنەوە شوێنی خۆیان.

## چۆنیەتی زەکات دان لەماڵی بازرگانی

ئەگەر بازرگان کاڵای بەنەقدی واتە دەست بەدەست دەفرۆشت وکاڵای نەدەهێشتەوە تا نرخی سەرکەوێت وگران بێت، ئەوە ساڵانە کاڵا بازرگانییەکانی دەقەبلێنی (تەنانەت گەر زیانیشی لێکەوتبێت چەند ساڵێك) ولەگەڵ دەستمایەکەی پێکەوە زەکات لەهەمووی دەدات. هەروەها زەکات دەردەکات لەو قەرزەی بەلای کەسێکەوە یان وەك کاڵای بازرگانی داویەتی پێی وکاتی وەرگرتنەوەی هاتوەو بەتەمایەتی.

بەڵام ئەو ماڵ وکاڵایەی قەرزە لای کەسێکی وا ناتوانێ بیداتەوە یان ستەمکارەو داگیری کردوەو بەتەمای نیە، زەکاتی لەسەر نیە، مەگەر دوای وەرگرتنەوەی. هەروەها ئەو ماڵەی لەسەرخۆی قەرز بێت یان بەپێشینە (سلفة) وەری گرێت وبیداتە قەرز زەکاتی لێنادرێت تا نەبێتە ماڵی خۆی.

### پرسیار

١- مەرجەکانی زەکاتدان کامانەن؟

٢- ئەو چینانە کێن زەکاتیان پێدەشێت؟

٣- دڵنەواکراوان کێن؟

٤- زانایان بەچ بەڵگەیەك دەڵێن زەکاتی کاڵا بازرگانیەکان پێویستە بدرێت؟

# وانەی حەڤدەم

## ماڵبەخشین وسوودەکانی

ئاینی ئیسلام هاندەرە بۆ ئاکارێکی پەسەندو سوودمەند، ئەویش خێرکردن وماڵبەخشینە کەئاکارو سیفەتی پێغەمبەران وچاکان بوە، بۆیە پێویستە باوەڕدارانیش خاوەنی هەمان ئەو سیفەتانەبن تەنانەت بەوشەیەکی باش وشیرینیش بێت.

بوارەکانی خێرو مەندی وچاکەکردنیش زۆرن، هەر لەبەخشینی ماڵ وسامان تا بەشداری لەپرۆژەی خێرخوازیدا یان خوێن بەخشین، یان هاوکاریکردن لەدروستکردنی خانوو بۆهەژاران وهەڵکەندنی بیری ئاو تا دەگاتە لابردنی ئازارو دڕك وداڵ لەسەر ڕێدا. هەروەها ئامۆژگاری وئاراستەی دروست لەریزی خێرکردن وبەخشین هەژمار دەکرێت. پێغەمبەری خودا (د.خ) دەفەرموێت ((الكلمةُ الطَّيّبةُ صَدَقَةٌ)).

## سوودەکانی خێرکردن

١- گوناه و تاوان لەسەر خاوەنەکەی دەسرێتەوە لای خودا.

٢- بەڵاو نەهامەتی لەکەسی بەخشەرو خێرکار دور دەکەوێتەوە.

٣- ماڵ وتەندروستی خێرخوازەکە فەڕی دەبێت وگەشەدەکات. پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێت ((ما نقصَ مالٌ مِنْ صدقَةٍ)).

٤- چارەسەرە بۆئازارو نەخۆشیەکان.

٥- بەڵگەیە لەسەر گوێرایەڵی موسڵمان وبەندەکان بۆخودای بەدیهێنەریان.

٦- دەبێتە مایەی ئاسودەیی ویژدان وراهێنان لەسەر بەخشندەیی وهەستکردن بەئازاری مرۆڤەکانی دیکە.

# خێری بەردەوام ونەبڕاوە

بەو خێرو چاکەیە دەوترێت کەپاداشت وخێری بۆخاوەنەکەی دوای مردنیشی هەر بەردەوام بێت. نموونەش لەسەر جۆری ئەو کارە خێرانە، ئەمانەن:

١- دروستکردنی مزگەوت وخوێندنگەو نەخۆشخانەو هەر دامەزراوەیەکی خزمەتگوزاری دیکە کە لەخزمەتی کۆمەڵگەدا بێت، هەر بەبەشداریکردن لەو پرۆژانەدا ئەو پاداشتە بەدەست دێت.

٢- هەڵکەندنی بیری ئاو وڕێکخستنی تۆڕی ئاو بەمەبەستی خواردنەوە یان ئاودێری رووەك.

٣- کارکردن لەبواری بڵاوکردنەوەو گەیاندنی زانستی جۆراوجۆر بەتایبەت زانستە شەرعیەکان، هەروەها دروستکردنی پەرتوکخانەی گشتی بۆ فێرخوازان.

٤- چاککردنی ڕێگاوبان، دروستکردنی پردو پردەباز بەتایبەت لەو شوێنانەدا کەدورە دەستن ودانیشتوانی کەم دەرامەتن.

## گفتوگۆ

١- موسڵمانی پابەند بەکێ دەڵێن؟

٢- سوودەکانیماڵبەخشین وخێرکردن چین؟

٣- مەبەست لەخێری نەبڕاوە چیە؟

ئەم بۆشاییانە پڕبکەرەوە:

١- هاوکاری خەڵك بەماڵ و............. و ............ دەبێت.

٢- بەخشین وخێرکردن لەسیفەت وئاکاری................ .

٣- الكلمة الطيّبةُ.................

٤- خودای گەورە فەڕو بەرەکەت دەخاتە ............ و ............ خێرخوازی بەخشندەوە.

# چالاکی

بۆلەبەرکردن:

١- ئایەتی ((مَثَلُ الَّذِينَ يُنْفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنْبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنْبُلَةٍ مِائَةُ حَبَّةٍ وَاللَّهُ يُضَاعِفُ لِمَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ))(٢٦١-البقرة).

٢- فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ) ((ما نقص مالٌ مِنْ صَدَقَةٍ)).

# وانەی هەژدەم

## لەمافەکانی موسڵمان لەسەر موسڵمان

### دورکەوتنەوە لەقسەی ناشیرین وناوزڕاندن وناو ناتۆرەو، درکاندنی نهێنی یەکدی

جنێودان وناوهێنانی یەکدی بەتانەو تەشەر ودەرخستنی کەم وکوری دوورن لەرەفتاری مرۆڤی موسڵمان وبەپێشێل کردنی مافی یەکدی دەژمێردرێن.

پێغەمبەری ئیسلام (د.خ) دەفەرموێت: ((**ليسَ المؤمنُ بالطعّانِ ولا اللعّانِ ولا الفاحشِ البذيءِ**)).

هەروەها دەفەرموێت: ((**مَنْ سترَ عورةَ أخيهِ المسلم في الدنيا سترَ الله عورتَهُ يومَ القيامة**)).

بۆیە پێویستە دووربین لەرەفتارو ئاکاری ناپەسەندو ئەوەی بۆ خۆمان پێمان ناخۆشە بۆکەسی بەرانبەر بەکاری نەهێنین، چونکە دەبێتە هۆی:

١- تێکچونی پەیوەندییەکان.

٢- دوشمنایەتی نێوان تاکەکان وکۆمەڵگەش.

٣- لەکەدارکردن ورووشاندنی کەسایەتی.



بەڵکو لەجیاتی ئەو ئاکارانە خۆشەویستی وئەمەك وهۆگری لەنێوان تاکەکاندا برویێت وچرۆبکات، تا پەیوەندیەکان پتەوو ژیان ئاسودە بێت.

# پاراستنی نهێنی ونەدرکاندنی

یەکێکی تر لەو مافانەی پێویستە لەنێوانماندا پارێزراو بێت پاراستنی نهێنی وناتەواوی یەکترە، نهێنی سپاردەیەو سپاردەش لێپرسینەوەی هەیە، پێغەمبەرمان (د.خ) دەفەرموێت: ((اذا حدث الرجلُ بحديثٍ ثُمَّ التفتَ فَهو امانَةٌ)). واتە گەر کەسێك لەکاتی گێرانەوەی قسەیەکدا چاوی دەگێرا کەواتە نهێنی تیابوەو پێویستی بە نەدرکاندنە، ئەمەش بەشێکە لەرەوشتی بەرزو پاراستنی سپاردە.

نهێنیەکان سێ جۆرن:

١- ئەوانەی شەرعی ئیسلام فەرمانی کردوە بە نەدرکاندنیان.

٢- جۆرێکیش ئەوەیە خاوەن نهێنیەکە داوای نەدرکاندنی دەکات.

٣- ئەو جۆرەی پێویستە نەدرکێنرێت بەڵام لەرێی پیشەو کارەوە ئاشکرا بووبێت.

## گفتوگۆ

١- ئاشکراکردنی نهێنی وناتەواوی خەڵك دەبێتە هۆی ئـ- ............ ب- ............ پ- ............

٢- جۆرەکانی نهێنی ئـ- ............ ب- ............ پ- ............

٣- نهێنی ..................... یەو درکاندنی لەشەرعدا ................

٤- ............... مافیان بەسەریەکەوە هەیە لەو مافانەش پاراستنی ............. یە.



## پاوانکاری وشاردنەوەی شمەك

**پاوانکاری بریتیە لە:** شاردنەوە یان دەستبەسەراگرتنی کالاّ سەرەکیەکانی ژیان وەك خۆراك لەلایـەن کەسـانێکەوە بەمەبەسـتی بـەرز بوونـەوەی نـرخ وفرۆشـتنی لـەکاتی گرانبونیـدا بەهاوولاّتیان.

## جۆرەکانی پاوانکاری

**١- پاوانکاری لەلایەن کەمینەیەکەوە:** واتە ژمارەیەکی کەم لەبەرهەمهێن یان فرۆشیار دەست بەسـەر کالاّیـەکی دیـاریکراودا دەگـرن وکاتێك دەیخەنـە بـازاڕ نرخـی بەرزبوبێتـەوە بـەهۆی کەمبونەوەی یاخود نەمانی لەبازاڕدا.

**٢- پاوانکـاری دولایەنـە:** واتـە بەرهـەمهێن یـان سـەرمایەدار لەگـەڵ کەسـێك ڕێکدەکـەون وبەهـەردوکیان سـەبارەت بـەو کالاّ تایبەتـە یـاری بـەنرخی دەکـەن ونـاهێڵن دەست بەدەستی دیکە بکات.

**٣- پاوانکاری تـەواو:** بـە دەستبەسـەراگرتنی کالاّیـەك دەڵێن لەلایـەن کەسـێکەوەو، نـەبونی هاوشێوەی دیکـەی ئـەو کالاّیـە لـەبازاڕو دەرەوەشـدا، بەمـەش هـەرخۆی بەتـەواوی دەتوانێت یاری بەنرخی بکات.

**٤- پاوانکـاری دەوڵـەت:** کاتێـك دەوڵـەت بەرهـەمهێنانی کالاّیـەکی دیـاریکراو پاوانـدەکات ولـەبازاڕ دەیگرێتـەوە، نرخـی سـەردەکەوێت وهـاوولاّتی زیانمەنـد دەبێـت. ئەمـەش جۆرێکـە لەپاوانکاری.

## زیان و دەرەنجامە خراپەکانی پاوانکاری

ئابوری وڵات گەر بەسستەمی سۆسیالیستی بەڕێوەدەچو، واتە دەوڵەت سەرپەرشتی دەکرد ئەوا ئامرازەکانی بەرهەمهێن لەدەستی دامەزراوە دەوڵەتیەکاندا دەبێت وتاك ڕۆڵی نابێت، واتە پاوانکاری دەوڵەت ڕوودەدات، بەپێچەوانەشەوە لەسستەمی سەرمایەداریدا تاك ڕۆڵ دەگێڕێت لەپاوانکاری بازاڕدا. لەهەردوو حاڵەتدا هاووڵاتی باجەکەی دەدات کەکۆمەڵێك مەترسیان لێدەکەوێتەوە، لەوانەش:

١- پاوانکاری دەبێتە هۆی کوشتنی گیانی کێبڕکێی نێوان تاکەکان ودەوڵەتانیش وبەرهەم لەڕووی جۆرو ئاستەوە چەق دەبەستێت.

٢- زۆرجار پاوانکار ناچار دەبێت بڕێك لەداهات وکاڵاکان لەناوبباب بەسوتاندن یان فڕێدان بەمەبەستی ڕاگرتنی بەها لەئاستێکداو، دانەبەزینی نرخ لەبازاڕدا.

٣- لەڕووی پەیوەندیە کۆمەلایەتیەکان وئاستی تاکیشدا ناتەبایی وکینە دەنێتەوەو کۆمەڵگە زیانمەند دەبێت.

٤- بەهۆی پاوانکارییەوە چەندین دەردی کۆمەڵایەتی وئابوری کوشندەی وەك بێکاری وهەڵاوسان وداڕمانی ئابوری ودیاردەی بەرتیل و دوو ڕویی ودزی وفێڵ....هتد لەکۆمەڵگەدا سەرهەڵدەدەن.

## دژایەتی ویەگژاچونەوەی ئیسلام بۆ پاوانکاری

ئاینی ئیسلام بەتوندی دژی پاوانکاری وسودی ناڕەواو شاردنەوەی قوتی بژێوی مرۆڤەکان دەوەستێت، بەڵکو دژ بەوانەی سوودی ناشەرعی دەبینن لەمامەڵەو بازرگانیدا جەنگی راگەیاندوە، لەلایەن خوداو پێغەمبەرەوە (د.خ) لەقورئانی پیرۆزدا. هەروەها پێغەمبەر (د.خ) فەرمویەتی ((لا يَحتكِرُ الاّ خاطيء)). (ئیمام ئەحمەدو موسلیم وئەبوداود گێڕاویانەتەوە).
دیسان دەفەرموێت (د.خ): ((مَن إحتكرَ على المسلمين طعامهم ضربه الله بالجذام والافلاس)) (ئیبن ماجە گێڕاویەتەوە).

## رێبازەکانی چارەسەرکردنی پاوانکاری

ئاینی ئیسلام بەرانبەر ئەم دیاردە ترسناکە هەڵوێستی هەیەو بەچەند شێوازێك بەرەنگاری دەبێتەوەو دەیەوێت شوێنەوارەکانی لەکۆمەڵگەدا بسڕێتەوە، لەم شێوازو رێبازانەش:
١- هۆشیاری پێدان وترساندنی پاوانکاران لەلایەن فەرمانڕەواو بەرپرسانی وڵاتەوە بەخستنە بازاڕی کاڵا شاردراوەکان بەنرخی گونجاو، لەکاتی سەرپێچیشدا واپێویست دەکات کاربەدەستان دەست بەسەر ئەو کاڵایانەدا بگرن کەبژێوی خەڵکیان لەسەرەو لەرێی دەوڵەت خۆیەوە بفرۆشرێن، ومافی خاوەنەکەشی پارێزراو دەبێت.
٢- دەوڵەت هەڵدەستێت بەهاوردەکردن یان بەرهەمهێنانی جۆری ئەو کاڵا سەرەکیانەی شاردراونەتەوە، بەجۆرێك لەبازاڕەکاندا دەستەبەربن بۆ هاووڵاتیان وپاوانکاران ناچاربکرێن دەست لەشاردنەوە هەڵگرن، بەمەش نرخ دادەبەزێت وپیلانی گرانفرۆشان پوچەڵدەبێتەوە.
٣- والاکردنی دەروازەی بازرگانی وئالوگۆر لەگەڵ دەوڵەتانی دیکەداو ئاسانکاری بۆهاوردەکردنی بڕی پێویستی کاڵا سەرەکیەکان، تا بازاڕەکان چۆڵ نەبن لەکاڵاو چاوچنۆکان هەلەکە نەقۆزنەوە بۆ گرانفرۆشی.
٤- نرخدانان: لەدۆخێکی تایبەتدا دەوڵەت بۆی هەیە نرخ لەسەر کاڵا پێویستەکان دابنێت بەشێوەیەك نەکڕیارو نەفرۆشیار زەرەرمەند نەبن، ئەمەش بەشێوەی کاتی ودوای چەند قۆناغێك لەچارەسەری بێ ئەنجام. چونکە نرخ دانان پرەنسیپێکی کاتی وناچاریە، ئەگەری

دروستبونی ستەم هەیە گەر بەرەهایی پەیڕەوبکرێت. پێغەمبەری خودا (د.خ) پێی خۆشنەبوە لەکاتی گرانیدا پەنابرێت بۆئەو بنەمایە، بەدەگمەن نەبێت. بەم شێوەیە ئاینی پیرۆزی ئیسلام بەچەندین شێواز ڕووبەڕووی گەندەڵی وپاوانکاری دەبێتەوە بێ ئەوەی ستەمیش لە فرۆشیار بکات چونکە ئاینی هەموانە. دژ بەبازرگان ودەوڵەمەندیش نیە، بەڵکو بازرگانی دەستپاك وهەرزانفرۆش لەریزی چاکاندا هەژمار دەکات وهەمیشە هەوڵی پێکەوە ژیان وتەبایی دەدات لەنێو چین وتوێژەکانی کۆمەڵدا.

## پرسیار

١- پاوانکاری چیە؟ ڕونی بکەرەوە.

٢- بوارەکانی پاوانکاری کامانەن؟ باسیان بکە.

٣- مەترسیەکانی دیاردەی پاوانکاری بژمێرە؟

٤- ڕێبازەکانی چارەسەری ئەم دیاردەیە لەئیسلامدا کامانەن؟ بیان ژمێرە.

## چالاکی

ئەم دوو فەرمودەیەی پێغەمبەر (د.خ) سەبارەت بەگرانفرۆشی بخوێنەرەوەو لەبەریان بکە:

١- مَنْ إحتَكَرَ حكرةً يُريدُ انْ يَغلي بها على المسلمينَ، فهوَ خاطِيءٌ.

٢- مَنْ إحتَكَرَ على المسلمينَ طَعامَهم، ضربَهُ الله بالجُذامِ والافلاس.

# چەند وانەو پەندێك لە ژیانی پێغەمبەران

## ٢- لەدایكبونی موسا (د.خ)

خودای پەروەردگار لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:

(( إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلَا فِي الْأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا يَسْتَضْعِفُ طَائِفَةً مِنْهُمْ يُذَبِّحُ أَبْنَاءَهُمْ وَيَسْتَحْيِي نِسَاءَهُمْ إِنَّهُ كَانَ مِنَ الْمُفْسِدِينَ (٤) وَنُرِيدُ أَنْ نَمُنَّ عَلَى الَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا فِي الْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ الْوَارِثِينَ (٥) وَنُمَكِّنَ لَهُمْ فِي الْأَرْضِ وَنُرِيَ فِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَجُنُودَهُمَا مِنْهُمْ مَا كَانُوا يَحْذَرُونَ (٦) وَأَوْحَيْنَا إِلَى أُمِّ مُوسَى أَنْ أَرْضِعِيهِ فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ فَأَلْقِيهِ فِي الْيَمِّ وَلَا تَخَافِي وَلَا تَحْزَنِي إِنَّا رَادُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ الْمُرْسَلِينَ (٧) فَالْتَقَطَهُ آلُ فِرْعَوْنَ لِيَكُونَ لَهُمْ عَدُوًّا وَحَزَنًا إِنَّ فِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَجُنُودَهُمَا كَانُوا خَاطِئِينَ (٨) وَقَالَتِ امْرَأَتُ فِرْعَوْنَ قُرَّتُ عَيْنٍ لِي وَلَكَ لَا تَقْتُلُوهُ عَسَى أَنْ يَنْفَعَنَا أَوْ نَتَّخِذَهُ وَلَدًا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ (٩) وَأَصْبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَى فَارِغًا إِنْ كَادَتْ لَتُبْدِي بِهِ لَوْلَا أَنْ رَبَطْنَا عَلَى قَلْبِهَا لِتَكُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ (١٠) وَقَالَتْ لِأُخْتِهِ قُصِّيهِ فَبَصُرَتْ بِهِ عَنْ جُنُبٍ وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ (١١) وَحَرَّمْنَا عَلَيْهِ الْمَرَاضِعَ مِنْ قَبْلُ فَقَالَتْ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَى أَهْلِ بَيْتٍ يَكْفُلُونَهُ لَكُمْ وَهُمْ لَهُ نَاصِحُونَ (١٢) ))(٤-١٢القصص).

موسا (د.خ) پێغەمبەرێكی خاوەن پەیامەو بۆ جولەكەكان نێردراوە، مەسیحی وموسڵمانانیش باوەڕیان پێی هەیە. موسا لەوڵاتی میسرو لەسەردەمی فیرعەونەكاندا هاتۆتە دنیاوە وەك قورئان ئاماژە دەكات. فیرعەونی (پادشای) میسر خەوێك دەبینێ تیایدا ئاگرێك لەبەنی ئیسرائیلەوە هەڵگیرساوە كڵپەكەی ئەو دەسوتێنێت ودەسەڵاتەكەی لەناودەبات، راڤەكارانی خەوەكە پێی دەڵێن منداڵێك كەلەنەوەی ئیسرائیل لەدایك دەبێت دەسەڵاتەكەی لێ دەستێنێت، بۆیە بڕیاردەدات هەر كوڕێك لەو نەوەیە هاتە دنیاوە دەبێ بكوژرێت. بەم شێوەیەو بەمەبەستی پاراستنی لەكوشتن دایكی كورە كۆرپەكەی دەخاتە سندوقێكی تەختەو بەئاوی نیلی دەسپێرێت، بڕیاری خودا وادەبێت روبارەكە ئەم سندوقە دەگەیەنێتە بەردەم كۆشكی فیرعەون وئاسیای خێزانی فەرمان بەهێنانی دەكات، كەبۆی دێنن بڕیاردەدات ئەم كۆرپەیە بكاتە منداڵی تاقانەی خۆی وبەخێوی بكات.

ئەم لەدایك بوونە ٥٠٠ ساڵ دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر یوسف (دخ)بوو واتە نزیکەی (١٩٨٢) ساڵ پێش هاتنە دنیای عیسای کوڕی مەریەم (دخ).

عیبریەکان لەسەردەستی دەست وپێوەندانی فیرعەوندا زۆر دەچەوسانەوە، بۆیە خودای میهرەبان خستیە دڵی دایکیەوە کە بەو ڕێگەیەی باسمانکرد ئەم کۆرپەیە بپارێزی وبیدات بەدەم ئاوەوەو ترسی نەبێت، چونکە خودا بەسەربازانی فریشتەی خۆی دەیپارێزێت ولەئەنجامیشدا دەیگێڕێتەوە ئامێزی گەرمی دایکی ولەپیلانی پیاوانی فیرعەون رزگاری دەبێت. فیرعەون وئاسیای کچی موزاحیمی خێزانی ڕێکدەکەون لەسەر بەخێوکردن وسپاردنی ئەم کۆرپەیە بەدایەن کەهەر لەکۆشکەکەیاندا ناوی **(موسا)**[1] یان لێنا تاببێتە کوڕیان ولەپیرییاندا جێیان بگرێتەوە.



لەولاشەوە دایکی موسا بەخەمباری ودڵە راوکێوە گوێی هەڵخستبوو بۆ هەواڵێکی کۆرپەکەی لەپڕ بەرگوێی مەریەمی خوشکی کەوت کەکۆشکی فیرعەون ئافرەتێکی شیردەریان دەوێت بۆ بەخێوکردنی کۆرپەیەك، ئەویش دایکی دێنێت وهەرکە کۆرپەکەی لەئامێزگرت بەفەرمانی خودا شیری ئەوی مژی وگریانی نەما، کە پێشتر چەندین ئافرەتی

---

١) **موسا**: لە ئاوەهەڵێنجراو (دەرهێنراو)

شیردەری تریان هێنابوو مەمکی کەسیانی نەدەگرت، ئەمەش لەمیهرەبانی خوداوە بوو کەبەم نەخشەیە موسای گێرایەوە باوەشی گەرمی دایکی وژیانی ئابوریشیان بوژایەوە. ئەم بەسەرهاتە بەقورئانی پیرۆز پشت راست کراوەتەوە لەسورەتی (القصص)دا. بەئایەتەکانی (٧-١٢). بەم شێوەیە موسا گەورە بوو، بوە خاوەنی دانایی وتواناو ئاوەز، پاشان خودای گەورە پەیامی (تەورات)ی بۆناردو کردیە پێغەمبەرێکی خاوەن عەزم(د.خ).

## پەندو وانە لەم بەسەرهاتە

گومانی تیانیە ئەم بەسەر هاتە پڕە لەوانەی گرنگ وسەیرە. نەخشەی خودای گەورە بوو کە موسا لەکۆشکی پاشایەتیادا گەورە بێت وپاشان لەرێی دایك وخوشك وخێزانەکەیەوە بزانێت کە ئەو لەنەوەی ئیسرائیلەو خودا بەو نەخشەیە لەتیاچون پاراستی. بۆیە پێگەکەی بەکارهێنا بۆکەمکردنەوەی ئازاری گەلەکەی لەسەردەستی پیاوانی فیرعەوندا بەپێی توانا. دەبێت موسا لەماڵی دوشمنەکەیدا گەورە بێت ودایکی کە بێ هیواببو لەژیان وئایندەی کۆرپەکەی موچەشی بۆ ببڕێتەوەو خۆی بەخێوی بکات و، پاشان موسا ببێتە پێغەمبەرو بانگی فیرعەون بکات بۆباوەڕو خوداناسی.



## ڕاهێنان

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

- موسا (دخ) لە کوێ لە دایک بووە؟
- بۆچی فیرعەون بڕیاری کوشتنی نێرینەکانی بەنی ئیسرائیلی دا؟

## گفتوگۆ

پەند لە چیرۆکی لە دایکبوونی موسا (دخ) چییە؟

## وانەی بیستو یەکەم

# چەند وێنەیەك لەژیانی هاوەڵان
# عومەری کوڕی خەتتاب ودایکی چەند منداڵێك

وەك سروشتی هەمیشەیی خۆی لەو شەوە تاریکەی نۆرەی سەردانی خانەوادە چادر نشینەکانی دەوروبەری مەدینەبوو، لەگەڵ بەردەستێکی دا بەناوی (ئەسلەم)، عومەری کوڕی خەتتاب بەرەو ئەو چادرە رۆیشت بۆئەوەی بزانێت لەو درەنگە بلێسەی ئەو ئاگرە چیە، نەبا شتێك گڕی گرتبێت: **سلاو دایە گیان، پێمان ناڵێی لەم درەنگی شەوەدا بەم گەرمایە ئاگرت بۆ کردۆتەوە؟**

- کوڕم، ئەو دوومنداڵەم لەبرسا دەگریان ومنیش هەندێك ئاوم کردە مەنجەڵێك ولەسەر ئەو ئاگرەم دانا تابێدەنگیان بکەم، وا خەریکە بەدەم هەنسکەوە خەو دەیانباتەوە: برسێتی ئەو منداڵە بێ باوکانەم لەئەستۆی عومەری جێنشین دایە.

- باشە، دایە گیان جاعومەر کەی ئاگای لەحاڵی ئێوەیە؟

- ئەی پێشەواو جێنشین نیە! بەڵێ ئەرکی ئەوە لێمان بپرسێتەوە.

عومەر زۆر ئازاری پێگەیشت بەم دیمەنەو دەستبەجێ لەگەڵ ئەسلەم گەڕانەوە مەدینەو لەگەنجینەی (بەیتولمالی) موسڵمانان کۆڵێکی گەورەی لەخۆراك وپێداویستی بەکۆڵداداو گەڕانەوە بەرەو پیرەژنەکە، لەرێدا ئەسلەم دەیویست کۆڵەکەی لێوەرگرێت ویارمەتی بدات بەڵام عومەر دایدەنەدەنا ودەیگوت: ئایا تۆ ئەتوانی کۆڵی گوناهەکانم لەقیامەتدا بۆ هەڵگری، نەخێر هەردەبێت خۆم هەڵی گرم، من بەرپرسم، من شوانم، خودا لەمن دەپرسێتەوە. هەر کەگەیشتن عومەر خۆی خۆراکی بۆ منداڵەکان ئامادەکردو زەردەخەنەی خستەوە سەرلێویان، دایکەکەیان، گوتی: خودا لێتان رازی بێت، کوڕم، ئێوە کێن؟

دایە گیان، سبەینێ بچۆ بۆلای جێنشین، لەوێ دەمان بینێت.

بۆ بەیانی پیرەژنەکە چوو بۆ لای جێنشین و بۆی دەرکەوت کۆڵبەرەکەی شەو خۆی بوو، بۆیە شەرم دایگرت وویستی بچێتە دواوە.

- دایەگیان، فەرموو دانیشەو لەمەولا لەبەیتولمال موچەی مانگانە وەردەگرن.

بەم شێوەیە گەورەی موسڵمانان عومەری کوڕی خەتتاب موسڵمانان وهەژارانی بەسەر دەکردەوەو بەکۆڵ خۆی پێداویستی بۆدەگواستنەوە.

## گفتوگۆ

١- بۆچی شەوانە عومەڕی کوڕی خەتتاب بەناو شارو دەوروبەردا دەگەڕا؟

٢- منداڵەکانی نێو چادرەکە بۆچی دەگریان؟

٣- مەبەستی پیرەژنەکە چی بوو کە گوتی (ئەرکی جێنشینە بەسەرمان بکاتەوە، بەڵام لێمان ناپرسێتەوە).

٤- کاتێك ئەسلەم ویستی کوڵە خۆراکەکە لەعومەر وەرگرێت وهەڵی گرێت، عومەر گوتی چی؟

٥- کەپیرەژنەکە هات بۆلای جێنشین، چی بۆکرا؟

٦- لەم ڕووداوە چی فێردەبی؟



## وانەی بیستو دووەم

# عەلی کوڕی ئەبی تالیب

**خودا لێی ڕازی بێت**

### ناوو نازناوی:

ناوی (عەلی کوڕی ئەبی تالب (عەبدولمەناف)ی کوڕی عەبدولموتەلیب کوڕی هاشم)ە ئامۆزای پێغەمبەری خودایە (د.خ) بە(ئەبوحەسەن) ناسراوە، نازناوی (امیر المؤمنین)ەو، چوارەم جێنشینی راشدینە. ١٠ ساڵ پێش هاتنی سروش بۆپێغەمبەر (د.خ) لەدایك بووە لەساڵی (٤٠)ی کۆچیدا کۆچی کردووە. گیانی خۆی بۆپێغەمبەر بەختکردووە.

ئەو شەوەی پێغەمبەر (د.خ) مەککەی بەجێهێشت وکۆچی کرد بۆمەدینە، عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەجێگەکەیدا مایەوە لەبەر دوو هۆ:

١- سەرتێکدان لەو جەنگاوەرە قورەیشیانەی هاتبون پێغەمبەر (د.خ) بکوژن، تا هەست نەکەن لەماڵ چۆتە دەرەوە.

٢- بەمەبەستی گێڕانەوەی سپاردەکان بۆخاوەنەکانیان کەلای پێغەمبەر (د.خ) دایان نابوو.



## بەشداریەکانی پێشەوا عەلی لەچالاکیە جەنگیەکاندا

مێژوونوسان کۆدەنگن لەسەر بەشداریکردنی پێشەواعەلی لەجەنگی بەدرو گۆڕەپانەکانی دیکەی جەنگدا جگە لەتەبوك، لەزۆر جێیشدا پێغەمبەر (دخ) ئالآی دەدایە دەستی. گرینگترین ئەو جەنگ وهێرشانەی بەشداربوە تیایدا ئەمانەن:

١- دەستە نێردراوەکان (حرکة السرایا).

٢- غەزوەی قوشەیرە.

٣- جەنگی بەدری یەکەم.

٤- جەنگی ئوحود.

٥- جەنگی بەنی نەزیر.

٦- جەنگی حمراء الاسد.

٧-جەنگی ئەحزاب (خەندەق).

## دەنگدان بەجێنشینی عەلی کوڕی ئەبی تالیب

بەهەلبژاردن پێشەوا عەلی کرایە جێنشین ئەمەش دوای شەهیدبونی جێنشینی سێیەم(عوسمان کوڕی عەففان)، چونکە لەمەدینەدا کەسیان لەو شایستەتر بەدینەکرد هەرچەندە خۆی نەیدەویست ئەو بەرپرسیە وەرگرێت. بەلآم سوربوونی هاوەلآن لەسەر دەنگدان بەپێشەوا عەلی ناچاری کرد ئەو ئەرکە قەبوڵکات. ماوەی جێنشینی (٤ساڵ و٩مانگ و٣رۆژ) بوو.

## واتای چەمکی کارگێڕی لای پێشەوای موسڵمانان، عەلی(ر.خ)

١- بوونی شارەزایی زانست.

٢- لەناوبردنی دۆگمایی.

٣- چاودێری هۆشیارانە.

٤- کار پێسپاردن بەپێی ڕێسای پێویست، نەك لەڕێی پەیوەندیی کەسییەوە.

## گفتوگۆ

١- ماوەی جێنشینی عەلی کوڕی ئەبی تالیب چەندبوو.

٢- هەڵبژاردنی عەلی بە جێنشین چۆن بوو.

٣- چاودێری لەکارگێڕیدا دەبێت چۆن بێت.

## وانەی بیستو سێیەم

# جێنشین و چاکسازی داد پەروەرو گەورە
# عومەری کوڕی عەبدولعەزیز(خ.ر):

ئەم جێنشینە ناوی عومەر کوڕی عەبدولعەزیز کوڕی مەروانی کوڕی حەکەمە زانایەکی بەتواناو خوداپەرست ودنیا نەویست بوە، هەربۆیە لەریزی (جێنشینە) راشدیەکان واتە بەپێنجەم جێنشینی راشیدین دەژمێردرێت لەدادگەری وبەڕێوەبردنی کاروباری موسڵماناندا.

عەبدولعەزیزی باوکی لەباشترین میرەکانی نەوەی ئومەییە بوو. جێنشین عومەر لەساڵی (٦١)ی کۆچیدا لەدایک بوەو لەساڵی (١٠١)ی کۆچیدا لەشام کۆچی دوایی کردوە. کەسێکی گەنم رەنگ ولاواز بوو لەجەستەدا، چەند فاکتەرێك رۆلیان هەبوو لەپێکهێنانی کەسایەتیدا لەوانە:

١- هەر لەتافی منداڵیدا هۆگری زانست بوو، هەروەها توانیشی قورئانی پیرۆز لەبەربکات.

٢- دۆخی کۆمەلایەتی: عومەر لەژینگەیەکی کۆمەلایەتی ئەوتۆدا دەژیا زۆر لەباربوو بۆ هەڵکەوتی کەسایەتی، ژینگەیەکی پڕ لەخوداناسی وچاکەکاری وزانستخوازی وپەیرەوکردن لەقورئان وسوننەت.

٣- لەسەر دەستی گەورە شارەزایان وزانایانی ئاینی دا لەمەدینە، پەروەردەبوو.



## ڕێڕەوی عومەر لەبەڕێوەبردنی وڵاتدا

**لەیەکەم وتاریدا دوای دانرانی بەجێنشین لەسەر دوانگە گوتی:**

((خەڵکینە من ئەرکێکم بەسەردا دراوە کەپرسم پێنەکراوە، داواشم نەکردوەو بەراویژکردنیش وەرم نەگرتووە، بۆیە ئێوە هیچ ناچارنین بەپابەندبون بە جێنشینی من وسەرپشك بن بۆهەڵبژاردنی کەسێکی دیکە)) خەڵکەکە بەیەك دەنگ هاواریان کرد، ئێمە هەموو تۆمان قەبوڵەو بەپێشەوای خۆمانت دەزانین، پشت بەخودا ببەستەو لەگەڵتاین، بۆیە دەستی کرد بەدانانی پلانی کارگێری بۆکۆمەڵی موسڵمانان وپێشەواتییان، چونکە زانی کەدەبێت ئەو ئەرکە بەجێبهێنێت وگوتی:

((دوای سوپاسی خودا، بزانن پێغەمبەرێکی دیکە پەرتوکیکی دیکە لەئاسمانەوە نایەت، حەڵاڵ تارۆژی دوایی هەر حەڵاڵەو بریاری خودا نەگۆرە، من بریاردەرو دادوەرنیم بەڵکو جێبەجێکارم، هەروەها داهێنەر نیم بەڵکو شوێنکەوتووم گوێرایەڵی هیچ کەسێك لەسەرپێچی فەرمانی خودادا ناکرێت، منیش چاکترینی ئێوەنیم بەڵکو کەسێکم وەك هەریەکێکتان، تەنها ئەوەیە بارێکی قورس لەسەر شانمە کەبەرپرسیە)).

## دادگەری لەسایەی حوکمی عومەری کوڕی عەبدولعەزیزدا

**لەدوو بواردا دادگەری عومەر وێنا دەکرێت:**

١- ڕێگری لەستەمکاری وگێرانەوەی ماف بۆستەم لێکراو نەهێشتنی پێشێلکاری سەبارەت مافی خەڵك لەگیان وماڵیان، لەگەڵ سزادانی ستەمکارو دەستدرێژیکار.

٢- وێنای دووەم: سەبارەت بە مافەکانی تاکە لەسەر دەوڵەت وپاراستنی ئازادییەکان وژیانی رۆژانەیان ، بەشێوەیەك پەککەوتەیەکی بێ ماف وهەرەشە لێکراوێکی ترسێنراو هەژارێکی بێ نەواو لاوازێکی بێ پشت بەدی نەدەکرا، کە ئەمانەن ئەرکی فەرمانرەوا لەئیسلامدا.

جێنشین عومەری کوڕی عەبدولعەزیز بەردەوام بوو لەسەر پیادەکردنی ئەم روکارانەی دادگەری، چونکە بەسپاردەیەکی جەماوەری دەزانی لەئەستۆیدا وخۆی بەکرێگرتەو خزمەتکاریان لەقەڵەم دابوو.

## کاروباری بواری کارگێڕی لەسەردەمی عومەردا

١- لەهەڵبـــژاردن ودەستنیـــشانکردنی کارمەنـــدان وبەرپرســـانی هـــەرێم وناوچـــەکاندا زۆر ڕەچـــاوی کەســـایەتیانی دەکـــرد، لـــەرووی خوداپەرســـتی وخێرخـــوازی وچـــاکەکاری ودادگەرییـــەوە، چـونکە ئـەوان نوێنـەری جێنـشین دەبـوون لـەو جێیانـە، ئاوێنـەی حـوکمی ئەوبوون.

٢- سەرپەرشتیکردنی ڕاستەوخۆ لەلایەن خۆیەوە بۆکاروباری کارگێڕی ناوچەکان، بـەوردو درشـــتەوە، لەگـــەڵ چـــاودێریکردنی ڕاپەڕانـــدنی کاروبـــاری دانیـــشتوان بەمەبەســـتی دەستبەرکردنی دادگەری.

٣- پلانـدانان بـەو واتایـەی کەپرۆسـەیەکە پێداویـستیەکانی ئاینـدە دابینـدەکات لـەرێی ئامادەسـازی هەنوکەییـەوە وەك نەخـشە ڕێگایـەك. عومـەری کـوڕی عەبدولعـەزیز لـەو جـۆرە سەرکردانەبوو بڕیاری پێشوەخت وبێ پلان وبێ لێکدانەوەی ئەنجامەکانی نەدەدا.

٤- ڕێکخستنی کاروبار لەسەردەمی عومەری کوڕی عەبدولعـەزیزدا: ئـەم چەمکە تەواوکـەری پلاندانانە بەمەبەستی بەکردەیی کردنی پلانەکان، لەسـەردەمی عومـەردا پرۆسـەی ڕێکخستن لەریزی کارە یەکەمینەکانیدا بوو.

٥- خۆپاراسـتن لەگەنـدەڵی کـارگێڕی: ئـەم جێنـشینە بـەرێزە کۆشـشی دەکـرد بـۆ ڕێگـری ولاگیری لەگەندەڵی کارگێری ودەروازەکانی ئەو دەردە کوشندەیەی بەستبو، تا درۆ وبـەرتیل ودیاری بردن بۆ بەرپرسان وزیادە ڕۆیی بنەبڕبکات.

## گفتوگۆ

١- فاکتەرە کاریگەرەکان لەسەر پێکهاتنی کەسایەتی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز، کامانەن؟

٢- (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز پەرۆش بوو بۆ هەڵبژاردنی کارمەندان وفەرمانبەرانی دەوڵـەت لەکەسانی خێرخوازو چاکەکار). ئەم دەستەواژەیە شیبکەرەوە.

٣- پێناسەی ئەمانەی خوارەوە بکە:

أ- پلاندانان لەئیسلامدا . ب-ڕێکخستنی بواری کارگێڕی.

٤- دادگەری لەسەردەمی عومەردا دوو بواری لەخۆگرتبو. کامانەن؟

٥- لەدیدی عومەری کوڕی عەبدولعەزیزەوە چەمکی (بەرپرسێتی ودەسەلات) چی دەگەیاند.

## چەند گۆشەیەك لەژیانی شوێنكەوتوان
## (زین العابدین) (س.خ)

شوێنكەوتووان: بریتیە لەو موسلمانانەی كە لە پاش كۆچی دوای پێغەمبەر(د.خ) هاتوونەتە دونیا، واتە چاویان بە پێغەمبەر(د.خ) نەكەوتووە، بەڵام چاویان بە هاوەڵانی كەوتووە، بنەماڵەو خانەوادەی پێغەمبەری خودا محمد(د.خ) پێگەیەكی گەورەو دیارو رێزداریان هەیە لای سەرجەم موسڵمانان، وەك ئەستێرەی ئاسمانی خوداناسی وپارێزكاری ورەوشتی بەرزو دنیا نەویستی وێناكراون وهەمیشە درەوشاوەبوون. ئەمەش وای كردوە خۆشەویستی وپەیرەوییان بەردەوام بوە لەنێو موسڵماناندا. لەهەڵكەوتوانی نێو ئەو خانەوادەیەش زین العابدین(س.خ).

### ناو ونازناوی

ناوی: عەلی كوڕی حوسێنی كوڕی عەلی كوڕی ئەبی تاڵبە. نازناوی بە(زین العابدین) ناسراوە بەواتای (پوختەو هەڵبژاردەی خودا پەرستان). لەرووی ئاكارو چاكە خوازی ویارمەتیدانەوە پێشرەو بووە.

### زانست ولەخوداترسانی

(زین العابدین) لەسایەو سێبەری حوسێنی باوكیدا گەورەبووەو زانست ومەعریفەی وەرگرتوە، باوكی وەك سەرمەشق سەیركردوە لەئاكارو رەوشتیدا. پەیوەست بوو بەمزگەوتی پێغەمبەرەوە (د.خ). هەمیشە هاوكۆڕی زاناو شارەزایان بوە. قورئانی پیرۆزی بەرامان وبیرلێكردنەوە دەخوێندەوە، بۆیە ببوە كەسێكی پارێزكارو خاوەن زانستی فراوان.



## نموونەیەك لەرەوشتی بەرزی

زین العابدین بەرەوشتی بەرزو پەسەند ناسرابوو کەبەڕاستی سەلماندبووی لەبنەماڵەی پێغەمبەرایەتیە. جێی ڕێزو ستایشی بەرزی خەڵك بوو، لەگەڵ ئامۆزایەکی ناکۆکی لێك تێنەگیشتنیان دەبێ، ئامۆزاکەی دەڵێت: بەتوڕەییەوە چومەلای وئەوەی نەشیاوبێت پێم گوت، بەڵام **(زین العابدین)** بێدەنگی هەڵبژارد. پاشان ڕۆیشتم.

لەشەودا لەدەرگامان درا، کە کردمەوە بینیم**(زین العابدین)**ە، وام زانی هاتوە تۆڵەی قسە توندەکانم لێبکاتەوە. بەڵام بەنەرمیەکەوە گوتی: ئەگەر قسەکانت راست بوە ئەوا داوا لەخودا دەکەم بمبەخشێت، خۆ ئەگەر ناراست بوە، ئەوا هیوادارم خودا لێت ببورێت.

پاشان سلاوی کردو بەجێی هێشتم، ئامۆزاکەی دەلێت: منیش بەدوایدا چوم وبەڵێنم پێی دا هەرچی ئەوەی پێی ناخۆش بێت نەچمەوە سەری، ئەویش منی لاواندەوەو گوتی: گەردنت ئازابێت هەرچیت گوتوە.

## گفتوگۆ

١- بنەماڵەی پێغەمبەر کێ دەگرێتەوە؟ پێگەیان لای موسڵمانان چییە؟

٢- (زین العابدین) نازناوی کێیە؟ بۆچی ئەو نازناوەی دراوەتێ؟

٣- چەند ئاکارێکی (زین العابدین) بڵێ؟

٤- ئەو وانەو پەندانە چین لەرووداوەکەی نێوان (زین العابدین)وئامۆزاکەیدا
بەدیدەکرێن؟

# وانەی بیست و پێنجەم

## لە زانایانی ناوداری کورد
## ( مەلا خەلیل سێرتی )



ئاشكرايه لەنێو گەلی کورددا زانای ناودار وهەڵکەوتو زۆرن کەخزمەتی ئاینی ئیسلامیان کردوه پشکیان هەبوه لەبنیاتنانی شارستانیەت وژیاری ئیسلامی ومرۆییدا. هەروەها رۆڵی گرنگیان گێراوه لەپەخشکردنی رۆشەنبیری گشتی وزانستی ئیسلامیدا. پەرتوکخانەی ئیسلامیان پاراوکردووه بەهەزاران بەرگ لەنوسراوو پەرتوك لەجۆرەها بواردا بەچەندین شێوه زمان، لەو زانا ناودارانەش مەلا خەلیلی (سێرتی)یه.

## ناو وبنەماڵەی

ناوی(خەلیل کوڕی مەلا حسین کوڕی مەلا خالید)ە. ساڵی ١٧٥٤ز لەهیزان ی خواروی دەریاچەی (وان)ی سەربەویلایەتی (تەبلیس) لەکوردستانی باکور چاوی بەژیان هەڵهێناوه.
ئەم زانایە بەمەبەستی خوێندن و وەرگرتنی زانیاری لەنێوان چەندین شارو ویلایەت لەخواروی تورکیاو باکوری عێراقدا هاتوچۆی کردوه. تا دواجار لەویلایەتی (سێرتی) جێگیربوەو هەلارلەوێدا لەساڵی ١٨٤٣ز کۆچی دوایی کردوەو نازناوی (سێرتی) هەرلەوێ پێ بەخشراوه.

# زانست و رۆشەنبیری

## ئەم زانایە:

سەر بە بنەماڵەیەکی زانست پەروەرو زانا دۆست بوە، هەر لەمنداڵیەوە بەهاوڕێیەتی باوکی دەچوە کۆڕی زانست لەمزگەوتەکانی کوردستان. کەسێکی زیرەك وهۆگری زانست وزانایان بوە. بەشێوەیەك لەماوەیەکی کورتدا فێری خوێندن ونوسین بوەو سەرنجی مامۆستایانی بۆ خۆی راکێشابوو.

مرۆڤێکی بەهیوابوەو خولیای وەدەستهێنانی پلەی بەرزبوە لەزانستدا، هەربۆیە لەنێوان شارەگەورەکانی دورگەی بوتان وتەبلیس وئامێدیدا هاتوچۆی کردوە. تا مۆڵەتی زانستی لەسەردەستی گەورە زانا (محمود بادینی) دا کەموفتی شاری ئامێدی بوە، بەدەست هێناوە. پیشەی مامۆستایی وپێش نوێژی لەزۆر جێدا بەجێهێناوە، ژمارەیەکی زۆر لەزاناو شارەزای ئاینی بەناوبانگی پێگەیاندووە.

گرنگی زۆری بەبواری ئەدەبی داوە بەهەردوو زمانی کوردی وعەرەبی و، زۆرێك لەپەرتوکی جۆراوجۆری ئەدەبی وئاینی لەزمانی عەرەبییەوە وەرگێڕاوەتەوە سەر زمانی کوردی بەشێوازێکی هونەری ناوازە.

سەرەرای ئەمانەش هۆگری هۆنراوە بوەو لەو بوارەشدا ژمارەیەکی زۆر لەکۆپلە هەڵبەستی هەبوە لەگەڵێك بواردا.

## نوسین وبەرهەمەکانی

ئەم زاناو ئەدیبە بەرهەمێکی فراوانی لەپەرتوك وپەڕاونامە هەبوە لەزانستی جۆراوجۆری ئاینی وئەدەبیدا. زۆربەی ئەو بەرهەمانەش بەزمانی کوردی وعەرەبی بوە کەژمارەیان لە(٣٥) پەرتوك وپەڕاونامە تێپەریوە گرینگترینیان:

١- تبصرة القلوب (لە راڤەکردنی قورئانی پیرۆزدا).

٢- منظومة نهج الانام (لە عەقیدەی ئیسلامدا – بەهەردو زمانی کوردی وعەرەبی).

٣- منظومة فی تجوید القرآن (بەزمانی کوردی).

# گفتوگۆ

١- مەلا خەلیل سەر بە چ بنەماڵەیەکەو کەی ولەکوێ لەدایک بوە؟

٢- ئەو گەورە زانایەی مۆڵەتی زانستی بەمەلا خەلیل بەخشی کێ بوو؟

٣- جگە لەبواری ئاینی، گرنگی بەچ بوارێکی دیکەدا بوو؟

٤- ژمارەی بەرهەمە نوسراوەکان چەندە؟

٥- ناوی سیان لەو بەرهەمانە بلێ ؟

٦-ناوی سیان لەزانایانی ناوداری کورد بلێ کەخزمەتیان بەئاینی ئیسلام کردبێت.

# ناوەرۆك